حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# سەرەتاکانی زانستی ئابووری

## بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی وێژەیی وبازرگانی

دانانی: د.زكي حسين قادر
د.جودت جعفر خطاب
د.خالد حيدر عبد
كامران احمد حمد

پێداچوونەوەی زانستی: د.محمد سلمان محمد
عمر علي شريف
احمد رسول درويش

چاپی نۆیەم ٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی

# بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

## پێشەکی

ئـەم کتێبـە هـەنگاوێکی نوێیـە لـە پلانـی بەڕێوەبەرایـەتی گـشتی پرۆگرامەکان لە وەزارەتی پەروەردە،دوای ئەوە دێ کە خوێندن لە قۆنـاغی ئامادەیی لە پۆلی دەیەمی ئامادەیی ( وێژەیی) وبازرگانی پۆلێن کرا بۆ دوو بەش– زانستی ووێژەیی– مەبەست لە دانانی ئەم کتێبە دەوڵەمەنـد کردنـی پرۆگرامـەکانی پـۆلی دەیـەمی ئامـادەیی و (وێـژەیی) و بازرگانی،چـونکە بابەتی زانستی ئابووری وەك پێویستییەکی گرنگی ئەم قۆناغی خوێندنەیە. بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکی تایبەت هەستا بـەم کارە،ولـە ئەنجامـدا ئـەم کتێبە دەکەوێتە بەردەستی فێرخوازانی خۆشەویست.

کتێبەکـەش شـەش بەشـە، سـەرەتاکانی زانـستی ئـابووری دەگرێتـە خۆی، لەبەشـی یەکـەم پێناسـەی زانـستی ئـابووری چـەمکە بنەرەتییـەکان ،ولەبەشی دووەمدا باس لە سیستەمە ئابوورییەکان دەکات.

هەرچی بەشی سێیەمی کتێبەکەیـە (بـیردۆزی خواسـت وخـستنەروو) دەگرێتە خۆی ولەبەشی چوارەم(نەرمی نواندن) روون دەکاتـەوە، ولەبەشـی پێنجەم (بیردۆزی رەفتاری بەکاربەر)ە وبەشی شەشەم (تێچوون وبـیردۆزی بەرهەم هێنان)ە.

جـا مامۆسـتایانی بـەڕێز وفێرخـوازانی ئـازیز ئـەم کتێبـە نوێیـە (سـەرەتاکانی زانـستی ئـابووری) لـە هـەر بابـەتێك تێبینیتـان هـەبوو ، بفەرموون بە پێشنیارەکانتان کتێبەکە دەوڵەمەند بکەن.

دانەران

# بەشی یەکەم

## سەرەتاکانی زانستی ئابووری

### سەرهەڵدانی زانستی ئابووری و پەیوەندی بە زانستەکانی ترەوە :

**یەکەم: سەرهەڵدانی زانستی ئابووری :**

وشەی ئابووری (Economics) لە زمانی ئینگلیزیدا دەگەڕێتەوە بۆ دوو وشەی لێکدراوی یۆنانی(Nomas) کەمانای بەڕێوەبردن یان هەڵسوڕاندن دێت (Oikos) کە مانای ماڵ دەگەیەنێت ، لەبەر ئەوەی مانای سەرەکی ئابووری بەڕێوەبردنی سەرچاوەکانی سامان بووە لە لایەن تاك یان کۆمەڵ یان حکومەتەوە. ئەمەش بەمانای ئەوەی مرۆڤ ئابووریانە هەڵسو کەوت دەکات ئەگەر هاتوو بە باشی سەرچاوەکانی سامانی بەکارهێنا یاخود لێهاتووانە بەکاری هێنا کە ئەمەیان بەمانای بەدەست هێنانی گەورەترین سووی ماددی بە کەمترین تێچوون و ڕەنج.

بیروڕا ئابوورییەکان لەسەردەمە کۆنەکاندا ﴿شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانی کە دوو شارستانی کۆنن﴾ بوونی خۆیان هەبووە، ئەرستۆ بەیەکەم کەس دادەنرێت کەسەرەتاکانی تیۆری ئابوری دارشتووە لە سەر بنەمای شیکردنەوەی دیاردەکانو گیروگرفتە ئابوورییەکان و یەکەم کەسە کە هەوڵی داوە ئابووری بکات بە زانست.

لە سەدەکانی ناوەراستدا بیروڕا ئابووریەکان هەبووە چ لە ئەورووپای مەسیحی یان لە ڕۆژ هەلاتی ئیسلامیدا، بەلام بوونی ئەم بیروڕا ئابوریانە مانای ئەوە نییە کە زانستی ئابووری بە مانا زانستیە تەواوەکەی بوونی هەبووبێ.زانستی ئابوری تارادەیەك لەمێژووی نوێدا دروست بوو لە پاش پەرەسەندنەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، بەو جۆرە چەند ڕەوتێکی نوێی

بیروڕای ئابووری پەیدا بوون لەوانەش (قوتابخانەی بازرگانییەکان) کە لە سەرەتای سەدەی پانزە هەبووە تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم، لە پاشاندا قوتابخانەی فیزیوکراتەکان (سروشتیەکان).

پاش ڕوودانی چەندین پەرەسەندن لەگشت بوارەکانی کۆمەڵایەتیو رامیاری و ئابووری لە ئەوروپا قوتابخانەی کلاسیکی پەیدا بوو وەك ڕەنگدانەوەیەك بۆ ئەوگۆران و پەرەسەندنانە ، پاش پەیدابوونی قوتابخانەی کلاسیك بیری ئابوری زۆر پێش کەوتو زانستی ئابوری بە تەواوی دروست بوو وە وەك زانستێکی سەربەخۆ سەری هەڵدا. لە ساڵی ١٧٧٦ز زانای ئابووریناسی ئوسکتلەندی ئادەم سمث کتێبی (سامانی میللەتان) ی دەرکرد کە بەدانانی ئەم کتێبە زانستی ئابوری پێشکەوتنێکی بەرچاوی بینی وەك تەواوکەرێك بۆ بۆچوونەکانی نوسەرانی قوتابخانەی کلاسیکی ئەگەر بە رەخنەگرتنیش بێ.

## دووەم: پێناسەی زانستی ئابووری:

زانستی ئابووری کۆمەڵێك پێناسەی جیاوازی هەیە بە هۆی فرەیی وهەمەلایەنی ڕۆڵی ئابووری و زیادبونی گرنگی ئەم زانستە، لەگەڵ بوونی جیاوازی لە ئاراستە بیرییەکانی سەرجەم قوتابخانە ئابوورییەکان. بۆ نموونە ووشەی ئابووری لای ئەرستۆ مانای (زانستی هەڵسوڕاندنی ماڵە)[1]

بەلاّم نووسەری فەرەنسی (مونکراتیان) لە کتێبی (توێژینەوە لە ئابووری سیاسیدا) دەڵێت زاراوەی ئابووری ڕامیاری مانای (پرەنسیپەکانی بەڕێوەبردنی ئابووری دەوڵەتە) لەبەر ئەوەی گرنگی دەدات بە بنەماکانی دارایی دەوڵەت[2].لە پاشاندا بەکارهێنانی زاراوەی ئابووری ڕامیاری بەرفراوان بوو تاوەکو ئابووری کۆمەلاّیەتیشی گرتەوە لە ساڵی ١٧٦٧ (جون ستیوارت مل) ئەم زاراوەیەی لە کتێبی ( An eqairy in to economy the principle of political) بەکارهێناوە. لەو سەردەمەدا ئەو باوەڕە باو بوو کە پێی وابوو زانستی ئابووری تایبەتە بە توێژینەوەی ئەو ئامرازانەی کە گرنگی دەدات بە دەوڵەمەندبوونی (وڵات، نیشتمان) لە ڕووی مادیەوە ئەم باوەڕە لە کتێبی (سامانی میللەتان)ی ئادەم سمیث دا ڕەنگی دایەوە کەساڵی ١٧٧٦ بلاّوکرایەوە.

(مارکس) زاراوەی ئابووری ڕامیاری لە کتێبی (سەرمایە) بەناونیشانێکی ناسەرەکی کە (ڕەخنەی ئابووری سیاسی) بوو لە ساڵی ١٨٦٧ بەکاری هێناوە . ئابووریناسی ئینگلیزی (ئەلفرێد مارشال) زانستی ئابووری پێناسە دەکات و دەڵێت (توێژینەوەیەلە چالاکی ژیانی ئاسایی مرۆڤ و وردبوونەوەیە لەو بەشەی چالاکی تاك و پەیوەندییە بەتینە

کۆمەڵایەتییەکەی بۆ بەدەست هێنانی بنەما مادییەکانی خۆشگوزەرانی و بەکارهێنانیان)[٣] هەروەها مارشال دەڵێت: (زانستی ئابووری بریتییە لە توێژینەوەلە سامان لە لایەك و توێژینەوە لە مرۆڤ لە لایەکی تر)[٤].

بەلاَم ئابووریناسی سویدی (ویکسل) پێی وایە کەدیاردەی ئابووری یاخود چالاکی ئابووری بریتییە لە (هەموو تەقەلایەکی ڕێکخراو بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە مادییەکان یاخود گەڕان بەدوای ئەو ئامرازانەی کەوا لەبەر دەستن بۆ هێنانەدی گەورەترین بڕی بەرهەم, یان هێنانەدی ئاستێکی دیاریکراوی بەرهەم هێنان تابکرێ بە کەمترین ئامرازەکان)[٥].

بەلاَم لای ئابووریناسی فەرەنسی (بیجو) (زانستی ئابووری ئامرازێکە بۆ توێژینەوە لە چۆنیەتی زیاد کردنی بەرهەم بە ئامانجی چاك کردنی ئاستی بژێوی)، هەروەها زانای ئینگلیزی (ڕۆبنز) پێناسەیەکی زۆر باو بۆ زانستی ئابووری دەکات کە ئەمڕۆ زیاتر قبول کراوە و بەکاردەهێنرێت (زانستی ئابووری بریتی یە لەو زانستەی لێکۆڵینەوە دەکات لە ڕەفتاری مرۆڤ وەك پەیوەندییەك لەنێوان ئامانجەکانی ولەنێوان ئەو ئامرازە دەگمەنانەیکە دەتوانرێ شوێنگرەوەی تری بۆ بەکاربهێنرێ) بەلاَم زانای ئەمەریکی (ساملسۆن) بەم جۆرە پێناسەی ئابوری دەکات ﴿زانستی ئابوری بریتیە لە توێژینەوە لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەو ڕێگایەی کەبەهۆیەوە تاك وکۆمەڵگا دەرامەتە دەگمەنەکان بەکاردەهێنن کە دەتوانێ شوێنگرەوەی تریان بۆ بەکاربهێنرێ بۆ بەرهەمهێنانی شمەکە هەمە چەشنەکان و دابەش کردنەوەیان بەسەر تاك و کۆمەڵگەدا بۆ ئەوەی بەکارە بێنن لە ئێستا یان لە ئایندەدا)[٦].

لەو پێناسانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەی پێناسەکان ئەوە دەردەخەن زانستی ئابووری جەخت دەخاتە سەر (چۆنیەتی بەکاهێنانی دەرامەتە دەگمەنەکان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە هەمەچەشنەکانی کۆمەڵگا).

## بەشێوەیەکی گشتی زانستی ئابووری تایبەتمەندە بەوەلاّم دانەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە:

١- ئەو شمەك و خزمەت گوزاریانەی کە بەرهەم دەهێنرێن چین؟ وە چەند بەرهەم دەهێنرێن؟.

ئەم پرسیارە ڕاستەوخۆ لە دەگمەنی دەرامەتەکانەوە دروست دەبێت ئەوانیش (کار، زەوی، سەرمایە، ڕێکخستن) پێداویستیەکانی مرۆڤ کە دەکرێت پڕبکرێنەوە لە ڕێگەی شمەك و خزمەت گوزاری بەکاربردنەوە، ئەمڕۆ لە جیهاندا ئەم پێداویستیانە بێ سنورن، بەلاّم لە بەرامبەر ئەم پێداویستییە زۆرانەدا خستنە ڕووی دەرامەتەکان بەش ناکەن بەڵکو تەنها بەشی بەرهەمهێنانی بڕێکی کەم لە شمەك و خزمەتگوزارییەکان دەکەن کە خەڵك دەیانەوێت، ئەم ڕاستییە وای کردوە کە پسپۆڕانی ئابووری ڕوو بە ڕووی گرفتێکی بنچینەیی بکاتەوە ئەویش گرفتی دەگمەنییە، کە دەرامەتی تەواو لەبەردەستدا نییە بۆ بەرهەمهێنانی سەرجەم ئەو شمەکانەی کە تاکەکانی کۆمەڵگە دەیانەوێت.

بەلاّم دەربارەی جۆری ئەو شمەکانەی کە دەبێت بەرهەم بهێنرێن یان بەرهەم نەهێرێن، ئەم بابەتە وابەستەیە بە گرفتی تەرخانکردنی

دەرامەتە دەگمەنەکان بۆ بەکاربردنە داواکراوەکان لـە چوارچێوەی بـوونی کۆمەڵێك لە شۆێنگرەوەکان (البدائل),بڕیاردانی تایبەت بۆ تەرخانکردنـــی ئەو دەرامەتانە لە ئابووری بازاڕی ئازاد دا لەلایـەن هێـزی بـازاڕەوە دەبێـت ئەویش یان خواست و خستنە ڕوە یان میکانیزمی نرخە.

٢- بە چ ڕیگەیەك ئەو شمەکانە بەرهەم بهێنرێت؟

لە کاتێکدا ئەم پرسیارە دروست دەبێت گەر هاتوو زیاتر لە ڕێگایەکی هونەری هەبێت بۆ بەرهەم هێنـانی شمـەك, بـۆ نمونـە دەکرێـت بـەروبوومی کشتوکاڵی بەرهەم بهێنرێت بە بەکارهێنانی شێوازی کشتوکاڵی چڕو پـڕ لـە ڕوبەرێکی بچوکی زەوی دا بەکارهێنانی بڕێکی گەورە لە پەیینی کیمیـایی و هێزی کاری زۆر و ئامێری پێشکەوتوو یان بە هۆی بەکارهێنانی ڕووبـەرێکی بەرفراوان لە زەوی و بەکارهێنانی بڕێکی کـەمی پـەیینی کیمیـایی و هێـزی کار و ئامێر, هەردوو ڕێگاکە دەشێت بەکاربهێنرێت بۆ بەرهەمهێنانی هـەمان بڕ لە هەندێ شمەك, ڕێگەی یەکەم ئابووری کردن لە زەویدا بـەکاردەهێنێت بـەلاّم دەرامەتـەکانی تـر زۆر بـەکاردەبات . بـەلاّم ڕێگـەی دووەم ڕووبـەری بەرفراوان لەزەوی بەکار دەهێنی،بـەلاّم دەرامەتـەکانی تـر ئابوریانـە بـەکار دەهێنی.

٣- چـۆن بـڕی بەرهــەمی شمــەك دابــەش دەکرێـت بەســەر تاکــەکانی کۆمەڵگەدا؟

مەبەسـت لـەم پرسـیارە ئەوەیـە چۆن بەرهـەمی نەتـەوەیی دابـەش دەکرێت بەسەر سەرجەم تاکەکان و و چینەکانی کۆمەڵگادا, وەکو کرێکاران و خاوەن زەوی و خاوەن سەرمایەکان لە سەرجەم وڵاتانــی دنیادا. تـا چ

ڕادەیەك حكومەت دەتوانێت سەركەوتوو بێت بەهۆی دەست تێوردانیوە لە ڕاستكردنەوەی شێوازی دابەش كردنی داهاتدا؟ ئایا ئەنجامی ئەم دەست تێوەردانە چی دەبێت؟

٤- ڕادەی لێهاتوویی لەبەكارهێنانی دەرامەتەكان چەندە؟

ئەم پرسیارە دوو پرسیاری دیكە دەگرێتە خۆ ئەوانەش:

أ- ئایا بەرهەم هێنان بەشێوەیەكی لێهاتووانە دەبێت؟

ب- ئایا دابەشكردنی بەرهەم هێنراو بە شێوەیەكی لێهاتووانە دەبێت؟

پاش ئاماژەكردن دەربارەی بڕی ئەو شمەكانەی كە بەرهەم هێنراون و چۆن بەرهەم هێنراون, وە بەسەر كێدا دابەش كراون, ئنجا ئەو پرسیارە دێتەوە ئاراوە ئایا بڕیارە تایبەتەكان بەبەرهەم هێنان و دابەشكردن بڕیاری لێهاتوون ولەشوێنی خۆی دان؟

٥- ئایا دەرامەتەكانی وولآت هەمووی بە تەواوی بەكارهێنراون یان هەندێكیان هێشتا كاریان پێ نەكراوە؟

دەشێ ئەم پرسیارە كەمێك نامۆ بێت، چونكە چۆن دەكرێت بگوترێت دەرامەتەكان دەگمەنن لە هەمان كاتدا پرسیار بكرێت دەربارەی بەكار نەهێنانی تەواوی دەرامەتەكان.گومان نییە هیچ كەس و حكومەتێك پلان دانانێت بۆبەفیرۆدانی دەرامەتەكان، بەلاّم ئەو ولآتانەی كە پێڕەوی سیستەمی بازاڕی ئازاد دەكەن هەندێك جار توشی كرداری بە فیڕۆ دانی دەرامەتدەبن، یەكێك لە ئەركەكانی زانستی ئابووری بریتی یە لە گەڕان بە

دوای ئەو هۆیانەی کە دەبنە هۆی ڕوودانـی ئـەو بارودۆخـە, یـان بڵـێین بـیَ کاری هاووڵاتیان و پاشان چارەسەر کردنی.

٦- ئایا توانـای ئـابووری وڵات بۆ بەرهەمهێنــانـی شمـەك و پێشکەش کردنی خزمەت گوزاریەکان گەشەدەکات (زیاد دەکـات)؟ یـان هـەر وەکـو خۆی دەمێنێتەوە؟

ئاشکرایە کە کـارێکی زۆری دەوێـت بـۆ ئـەوەی بزانرێـت ئایـا توانـای ئابووری نیشتمانی بە جێگیری و نـەگۆڕی دەمێنێتـەوە دەربـارەی بەرهـەم هێنانی شمەك و پێشکەش کردنـی خزمەتگوزاریـەکان یـاخود پەرەدەسـێنن ساڵ دوای ساڵ. ئەگەر هاتوو ئەو توانایە پەرەی سەند بەشێوەیەکی ڕوو لـە زیادی (وەکو زۆربەی وولاتانی ڕۆژ ئاوا بە درێژایی سەدەکانی ڕابـردوو) ئـەو کاتە دەشـێت زیادبوونێـکی خێـرا و گـەورە بێتـە دی لـە ئاسـتی بـژێوی و گوزەرانی خەڵکدا. بابەتی پەرەپێدانی تواناکـانی بەرهـەم هێنـان گـرنگترین کێشەن کە بیری ئابووریناسانیان سەرقاڵ و خەریك کردووە لە سـەردەمی ( ئادەم سمث) ەوە تاکو ئەمڕۆ.

## زانستی ئابووری و پەیوەندی
## بە زانستەکانی ترەوە

زانستی ئابووری بە یەکێك لەو زانستانە دادەنرێت کە پەیوەندی و تێکەڵاو بوونی زۆری لەگەڵ زانستەکانی تردا هەیە, ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کاریگەری زۆری هەیە لە سەر زۆربەی لایەن و ئاراستەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی, وە دەکرێت کورتەی هەندێك لەو پەیوەندیانە ڕوون بکرێتەوە بەم جۆرەی لای خوارەوە:

١- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و زانستی ڕامیاری:

زانستی ئابووری پەیوەندی توند و تۆڵی بە زانستی ڕامیاریەوە هەیە, چونکە زانستی ڕامیاری گرنگی دەدات بە چاودێری کاروباری کۆمەڵگا,زانستی ئابووریش گرنگی دەدات بە کاروباری کۆمەڵگا لە گۆشەی پێداویستییەکانی وچۆنیەتی پڕکردنەوەیان, هەروەها کار بەدەستە سیاسیەکان دەبێت بەرچاو ڕوونی تەواویان هەبێت دەربارەی بارودۆخی ئابووری لە کاتی بڕیاردانداا.

وەك زانراوە زۆربەی جەنگ و شۆڕش و ڕاپەڕینەکان هۆکاری ئابووری لە پشتەوە بووە, بارودۆخی ئابووری زۆرجار وێنەی بەڕێوەبردنی رامیارییەکان دەکێشێت،بۆیە دەتوانرێ بوترێ کە رامیاری و ئابووری دوو ڕووی یەك دراون.

### ٢- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و مێژوو:

زانستی مێژوو تۆماری پێشکەوتنی مرۆڤە لە سەرجەم ئەو قۆناغانەی کە پیایدا تێپەڕیوە , لەگەڵ ئەو ڕوودا و بارودۆخانەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤ بۆتەوە و دەربڕینی چۆنیەتی کارکردن لەگەڵیاندا, زانستی ئابووری ناتوانێت مێژووی ئابووری و ئەزموونی گەلان لە بواری ئابووریدا فەرامۆش بکات , زانستی ئابووری هەوڵ دەدات خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئەزموونی گەلان بزانێت بە هۆی مێژووەوە، هەروەها چۆنیەتی بەکارهێنانی دەرامەتە ئابوورییەکان لە کۆن دا بزانرێت ، تۆمارەکانی مێژووی ئابووری ئەم بارودۆخانە دەگوازێتەوە بۆ نەوەکانی ئاییندە.

### ٣- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و ئامار:

پەیوەندی نێوان ئابووری و ئامار پەیوەندیەکی توند و بەهێزە، چونکە شیکردنەوەی ئابووری بە تایبەتی پێوانە کاری بەڕادەیەکی زۆر پشت دەبەستێ بەزانیارییە ئامارییەکان، هەروەها شێوازی ئامار ئاسانکاری دەداتە توێژەی ئابووری لە بواری کاری خشتەو وێنەکردنی چەماوەکان کە دەربڕی دیاردە ئابوورییەکانن.

### ٤- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و دەروون ناسی:

زانستی ئابووری پەیوەندی هەیە بە دەروونناسییەوە، چونکە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی تاکەکانی کۆمەڵگا بە ڕێگایەکی دیاری کراو کاریگەری هەیە لەسەر پەرەسەندنە ئابووریەکان لەو کۆمەڵگایەدا. توێژەری ئابووری گرنگی دەدات بە زانینی ڕەفتاری تاکە کەس لە کاتی خەرجکردنی داهاتەکەیدا بۆ کڕینی شمەك و خزمەتگوزاری، گومانی تێدا نییە لە پشت ئەو ڕەفتارانەوە هۆکار و پاڵنەری دەروونی هەیە.

### ٥- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووری و لۆژیك (المنطق):

بـــیردۆزی زانستییەکان بـــە گـــشتی و بـــیردۆزە ئابوورییەکان بـە تایبەتی,ڕاست نین ئەگەر بێتو لۆژێکی (منطقي) نەبن, کەس ناتوانێت تێـی بگات ئەگەر بێتو توێژەر نـەزانێت چـۆن پێـشەکی و سـەلمێنراوەکان بـەکار بهێنێت و بیروڕای نوێیان لەسەر دروست بکات بۆ گەیشتن بە دەرئەنجامی نوێ, لەبەر ئـەوەی ئەگـەر گریمانـەکان لـۆژیکی نـەبن دەبێتـە هـۆی بـەدی هاتنی دەرئەنجامی هەڵە و دەرئەنجامی ناڕاست.

### ٦- پەیوەندی نێوان زانستی ئابووریو بیرکاری:

زانستی ئابووری زۆرجار پـشت دەبەسـتێت بـە بـەکارهێنانی شـێوازە بیرکاریەکان لە شیکردنەوە و سەلماندنەکان دا وە بە بێ شێوازی بیرکاری زانستی ئابووری ناتوانێت بگاتە ئاکامی ڕاست و تەواو.

# گرفتی ئابووری

زۆری پێداویستییەکانی مرۆڤ و دەگمەنی دەرامەتەکان بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێداویستیانە دوو هۆکاری گرنگی پەیدابوون و سەرهەڵدانی گرفتی ئابوورین گۆڕوتینی ئەو گرفتانە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە ، بۆشیکردنەوەی گرفتیئابووری جەخت دەکرێتەسەرئەم لایەنانە :-

یەکەم: چەمکی گرفتی ئابوری .

دووەم:تایبەتمەندییەکان و هۆکارەکانی گرفتی ئابوری .

سێهەم: پایەکانی گرفتی ئابوری .

## یەکەم: چەمکی گرفتی ئابووری:

ناوەڕۆکی گرفتی ئابووری بەستراوەتەوە بە دەگمەنی دەرامەتە ئابووریە پێویستەکان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستە بێ سنورەکانی کۆمەڵگا لەبەرئەوە بەستراوەتەوە بە دوو هۆکاری سەرەکی یەوە:

١. پێداویستییەکانی مرۆڤ:

پێداویستی (الحاجة) بریتی یە لە بوونی ئارەزوو لە لایەن مرۆڤەوە بۆ بە دەست هێنانی شمەك و کارگوزاری, بۆیە دەشێت بە ئالۆز ناوزەد بکرێت, وە ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:-

أ-پێداویستییەکانی مرۆڤ زۆر و جۆراوجۆرن و ئاڵۆزن.

ب–پێداویستییەکانی مرۆڤ تـازە دەبنـەوە وەك پێداویـستی مـرۆڤ بـۆ خـواردن ، سـەرەڕای ئـەوەی مـرۆڤ پـاش ماوەیـەك لـە تێـر بـوونی برسـی دەبێتەوە وە دەبێت جارێکی تر پێداویستیەکە پڕ بکاتەوە.

ج – پێداویستیەکانی مرۆڤ تێکئالاون.

٢. دەگمەنی دەرامەتەکان :

لێرەدا پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان دوو جۆر دەرامەت دا:

أ– دەرامەتە نا ئابووریەکان :

ئەمەش بریتی یە لەو دەرامەتانەی کە سنوردار نین, بە مانای بونیـان لە سروشتدا زۆرە کـە لـە پێداویـستی مـرۆڤ زیـاترە، بـە مانـای ئـەوەی کـە دەگمـــەن نـــین واتـــە شمـــەکی گـــشتین وەکـــو(هـەوا، لم، دەریـا، و زەریاکان، ....هتد)

ب – دەرامەتە ئابوورییەکان:

ئەمانە بریتین لەو دەرامەتانـەی کـە ئـامرازی سـەرەکی پڕکردنـەوەی پێداویستیەکانی مرۆڤن وە ئەم دەرامەتانە بە شێوەیەکی ئاسایی کراون بـە چوار جۆرەوە,پێیان دەوترێت بنەماکانی بەرهەم هێنان:

١–کار (العمل) (هێزی کار):

کار بـریتی یـە لـە چـالاکی هۆشـیارانە و ئامـانج داری مـرۆڤ کـە مـرۆڤ ئـەنجامی دەدات لـە پێنـاوی بەرهـەم هێنـانی شمـەك و پێـشکەش کردنـی خزمەتگوزاری,دەشێت ئەو چالاکیە بیری بێت یان چالاکی هێزی بازوو بێـت کە بە هۆیەوە مرۆڤ کار لە سروشت دەکات و دەی گۆڕێـت و دەیگونجێنێـت بەو جۆرەی پێداویستیەکان تێـر بکـات.کـار مـەرجێکی پێویـستە بـۆ ژیـانی

مرۆڤ لەبەرئەوەی وەلأمی پێداویستیە مادی ومەعنەوییەکانی مرۆڤ دەداتەوە وە دەبێتە هۆی دارشتنی پەیوەندیە کۆمەلأیەتییەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەلدا.

دانیشتوان سەرچاوەی بنەمای کارن بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لە نێوان (٢٠-٦٠) ساڵدان ئەم دەستەی تەمەنە لە رووی ئابوریەوە کەسانی چالاکن بۆ بەرهەمهێنان و زیاتر بەشداری دەکەن لە پرۆسەی بەرهەمهێنان دا ,وە خاوەنەکانی هێزی کار پاداشتەکانیان لە پاش بەشداری کردن لە پرۆسەی بەرهەمهێنان دا لە شێوەی (موچە و کرێ) دا وەردەگرن.

٢-زەوی (دەرامەتە سروشتیەکان) :

مەبەست لەزەوی وەك یەکێك لە بنەماکانی بەرهەمهێنان سەرجەم هەموو ئەو دەرامەتانە دەگرێتەوە لە سەر زەوی و لەناو زەوی دا هەیە. دەکرێت زەوی لە پرۆسەی بەرهەم هێنان بخرێتە کار بەم جۆرە:ـ

أ- بەکارخستنی زەوی بە مەبەستی کشتوکاڵی.

ب- بەکارخستنی زەوی بە مەبەستی کەڵك وەرگرتن لە کەرەسەی خاو وکانزاکان و نەوتی خاو ... هتد.

ج- بەکارخستنی زەوی بە مەبەستی کەڵك وەرگرتن لە هێزە سروشتیەکان وەك دەریاکان ,تاڤگەکان ,رووبارەکان....هتد.

ئەو داهاتانەی کە لەبنەمای زەوی بە دەست خاوەنەکانیان دەگات لە کاتی بەکارخستنی دا (موڵکانەیە).

٣-سەرمایە:

یەکێکە لە بنەما هەرە گرنگەکانی بەرهەمهێنان. بریتییە لەو پێناو (وسیلة) ئامرازانەی کە بەرهەم هاتووە بە ئامانجی بەکارخستنیان لە پرۆسەی بەرهەمهێنان دا وە بەو جۆرە سەرجەم ئامێر و کەرەسە و هۆکانی گواستنەوە و پرد و ڕێگا و بان و وێستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەبا و هەموو ئەو شتانەش کە مرۆڤ پەرەی پێداوە بە بیرو هێزی بازوو تا بووە بە ئامراز و بەکار دەخرێت لە پرۆسەی بەرهەمهێنان دا, داهاتی سەرمایە پێ ی دەوترێت سوود (الفائدة).

٤- ڕێکخەر (ڕێکخستن) :

ئەمەش بریتییە لە بەڕێوەبردنی دەرامەتەکانی پێشوو (وە هەڵسوڕاندنیان) لە ڕێگەی پرۆسەی بەیەکەوە گرێدان بەڕێژەی دیاری کراوبۆ بەرهەمهێنانی شمەك و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری دیاریکراو, وە گرینگترین ئەرك وفەرمانی ڕێکخەر لێکۆڵینەوەی شوێنی پرۆژەیە و گەڕانە بەشوێن سەرچاوەکانی کەرەسەی خاودا, هەروەها لێکۆڵینەوەیە لە بازاڕ و چەندین ئەرکی تر داهاتی ئەم بنەمایە کە ڕێکخەرەکان بە دەستی دێنن پێ ی دەوترێت (قازانج).

## دووەم: تایبە تمەندیەکان و هۆکارەکانی گرفتی ئابووری :

١- دەگمەنی :

دەگمەنی هۆکارێکی گرنگە لە هۆکارەکانی گرفتی ئابوری, دەگمەنی لە چەمکی ئابوریدا مانای نە بوونی شمەك نی یە, بەڵکو بریتی یە لە وەی

كە ئەو شمەكانە بەشى پێداويستيەكان ناكەن بە تەواوى, چونكە بوونى دەرامەتى ئابورى بە برى دياريكراو نابێتە هۆى پڕكردنەوەى سەرجەم پێداويستيەكانى كۆمەڵگە ,ئەمەشماناى وايە كە كۆمەڵگە ڕووبەڕوى دەگمەنى دەبێتەوە بۆيە لێرەدا پێويستە باس لە دەگمەنى ڕێژەيى بكرێت بەماناى (ڕێژەى دەرامەتە بەر دەستەكان بۆ پێداويستيەكانى مرۆڤ) بۆ نمونە ئەگەر هاتوو پێداويستى ولاتێك سالانە (١٠٠٠٠٠) تەن بێت بۆ گەنم بەلام لەو ولاتەدا سالانە تەنها (٦٠٠٠٠) تەن گەنم بەرهەم بهێنرێت دەتوانرێت بگوترێت ئەو ولاتە بەرەو ڕووى دەگمەنى دەبێتەوە لە بەرهەمهێنانى ئەو بەرو بوومەدا.

بەلام دەشێت ولاتێكى تر تەنها (٥٠٠٠٠) تەن بەرهەم بهێنێ و لەهەمان كاتدا پێداويستى بە (٥٠٠٠٠) تەن هەيە لەو كاتەدا ئەو ولاتە گرفتى دەگمەنى نيە لە بوارى بەرهەمهێنانى گەنم دا.

## ٢-هۆكارى هەڵبژاردن (اختيار):

بە هۆى سنوردارى دەرامەتەكان لە لايەك و زۆرى پێداويستيەكانى كۆمەڵگە لە لايەكى ترەوە, ئەوا ئەو كۆمەڵگەيە توشى گرفتى هەڵبژاردن (اختيار) لە نێوان پێداويسيەكان دەبێتەوە كە دەتوانرێت پڕبكرێنەوە بەهۆى ئەو دەرامەتانەى كە هەن وە هێشتنەوەى ئەو پێداويستيانەى تر بێ ئەوەى پڕبكرێنەوە ئەمەش ماناى ئەوەيە گرفتەكە وەك خۆى دەمێنێتەوە وە دەتوانين ئەمە بەم هێڵكاريە ڕوون بكرێتەوە:

کۆمەڵگا

١. پێداویستی بۆ نیشتەجێ بوون — پڕکراوەتەوە
٢. پێداویستی بۆ خۆراك — پڕکراوەتەوە
٣. پێداویستی بۆ جل و بەرگ و پۆشاك — پڕکراوەتەوە
٤. پێداویستی بۆ هۆکانی گواستنەوە و هاتوچۆ — پڕنەکراوەتەوە

دەرامەتە دەگمەن و سنور دارەکان

لە کاتێکدا کۆمەڵگا بتوانێت سێ پێداویستی یەکەم پڕبکاتەوە و پێداویستی چوارەم (پێداویستی هۆکانی هاتووچۆ )پڕنەکاتەوە, ئەوا مانای ئەوەیە کە گرفتی ئابووری هەر ماوە.

٣-هۆکارەکانی قوربانیدان (بەختکردن):

دەرامەتە ئابوریەکان بە کارخستنی جۆراو جۆریان هەیە بە مانای ئەوەی کە دەتوانێت کۆمەڵگا پێداویستی بەیەك جۆر دەرامەت هەبێت بۆ چەند بەکارهێنانێك,بەلاَم بەهۆی هۆکاری دەگمەنی یەوە (دەرامەتەکان سنووردار ودیاریکراون) کۆمەڵگا ناچار دەبێت کە دەرامەتێك ئاراستەی یەك بەکارهێنان بکات و واز لە دەرامەتەکانی دیکە بهێنێت.

ئەمەش مانای ئەوەیە دەبێت قوربانی بدات بەبەکارهێنانە شوێنگرەوەکانی ئەم دەرامەتە.بەمەش دەوترێت ( تێچوونی هەلی شوێنگرەوە) بۆ نموونە پارچە زەوی یەك هەیە, بەلاَم کۆمەڵگا پێویستی پێی هەیە بۆ چاندنی گەنم یاخود دروستکردنی خانوو یاخود بە خێوکردنی مەڕو مالاَت ئەگەر هاتوو ئەم زەوییە کرا بە گەنم ناکرێت بە خانوو وە بەکارناهێنرێت بۆ بەخێوکردنی مەڕ و مالاَت بەو جۆرە دەبێت قوربانی بدات بە خانوو دروستکردنی و بەخێوکردنی مەڕومالاَت ، وەک لەم هێڵکاریەدا دیارە:

| | |
|---|---|
| بەكارخستنی زەوی ↖ | ١- چاندنی گەنم |
| بەكارهێنانی دەرامەت ✗ | ٢- دروستكردنی خانووبەرە |
| پارچە زەوی یەك ✗ | ٣- بەخێوكردنی مەڕومالآت |

### سێیەم - پایەكانی گرفتی ئابووری:

گرفتی ئابووری چەند پایەیەكی سەرەكی دەگرێتە خۆ كە ڕووبەڕووی زۆربەی كۆمەلگاكان دەبێتەوە وە ئەم پایانە پابەندی كرۆكی گرفتی ئابووریە كە ئەمەش لە زۆریی پێداویستی و دەگمەنی دەرامەتی پێویست بۆ پڕكردنەوەیان خۆی دەبینێتەوە,ئەو بنەمایانەش ئەمانەن:

أ- چی بەرهەم دەهێنی (جۆرو بڕی بەرهەم)

ب- چۆن بەرهەم دەهێنی (شێوازی بەرهەم هێنان).

ج - بۆكێی بەرهەم دەهێنی (دابەش كردنی بەرهەم) .

## چەمکە بنەڕەتییەکانی زانستی ئابووری

### یەکەم: بیردۆزی ئابووری:

بە شێوەیەکی گشتی بیردۆز (Theory) مانای پوختەکردن وئاسان کردنی واقعە بە جۆرێك یارمەتی دەربێت بۆ تێگەیشتنی ئەو واقعە بە شێوەیەکی باش و پێشبینی کردنی ئەوەی کە روودەدات لە ئایندە دا, پوختەکردن باشترین ئامرازە بۆ تێگەیشتن و دۆزینەوەی پەیوەندیەکان لە نێوان گۆڕاوەکاندا, زانستی ئابووری لە کۆمەڵێك بیردۆز دروست بووە کە سەرکەوتوو بوون لە لێکدانەوەی دیاردە ئابورییەکان یان بەکارهێنراون وەك ئامرازێك بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو پەیوەندیانەی کە لە نێوان دیاردە ئابووریە جیاوازەکاندا هەیە. کەواتە دەشێت بوترێت کە بیردۆزی ئابووری بریتی یە لە کۆمەڵێك گریمانە و چەند پێناسەیەك دەربارەی دیاردەیەکی ئابووری دیاریکراو بۆ لێکدانەوەی ئەو دیاردەیە و گەیشتن بە دەرئەنجامی نوێ لەبارەی ئەو دیاردەیە،بۆ ڕوون کردنەوەی ئەمەش ئەم نمونەیە دەخەینە ڕوو:

ئەگەر هاتوو توێژەرێکی ئابووری ویستی پەیوەندی نێوان بڕی خواست و نرخ یان داهات یان بڕی خستنە ڕوو لەگەڵ نرخ ڕوون بکاتەوە , ئەوە دەبێت لە ڕووی پراکتیکی یەوە ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە تاکە نرخ کاریگەری لەسەر بڕی خواست یان خستنە ڕوو نییە، یان تەنها داهات تاکە هۆکار نی یە کە کاریگەری هەبێت لە سەر بەکاربردن, بەڵکو کۆمەڵێك هۆکاری تر هەن کە کاریگەریان هەیە لەسەر خواست و خستنە ڕوو, لەبەر ئەوە توێژەر پەنا دەباتە بەر گریمانەکان (بیردۆز و لێکدانەوەکان) بۆ

ئامــادەكردنی دۆزێكــی لــەبار بــۆ جــەخت كردنــە ســەر ژمارەیــەك لــە پەیوەندیەكانی نێوان گۆڕاوە ئابووریەكان نەك هەموویان.

## دووەم: شیكردنەوەی ئابووری:

مەبەست لە شی كردنەوەی ئابووری بەش بـەش كردنـی ئـەو دیاردە ئابوورییە كـە توێـژەر لێـی دەكۆڵێتــەوە بـۆ ئـەو توخمانــەی كـە ئـەو دیاردەیەیان پێك هێناوە سنوورەكانی دیاری دەكات لەگـەڵ لێكۆڵینـەوەی پەیوەندیەكانی نـاو ئـەو دیاردەیـە , ئـەم جۆرە شیكردنەوەیە بـە هـۆی بەكاربردنی شێواز و ڕێگابیركارییەكان ئەنجام دەدرێت كە پەیوەندیـە ئـاڵۆز و تێك ئاڵاوەكان دیاری دەكات. دیاری كردنـی بیركاریانـە نابێـت دوور بێـت لەو ڕووداو و دیاردانەی كە لە جیهـانی بابەتـەكی داهـەن.دەشـێت لـە چـوار چێوەی شی كردنەوەی ئابووری دا بە پێی پێوەری یەكە بەرهـەم هێنـەكان جیاوازی بكرێت لە نێوان دوو جۆر شی كردنەوەدا:

### جۆری یەكەم – شیكردنەوەی ئابووری هەمووەكی: (Macro Economic analyses):

ئەم جۆرە گرنگـی دەدات بـە شـی كردنـەوەی یەكـە ئابووریـەكان لـە سەر ئاستی هـەمووەكی یـان لـە سـەر ئاسـتی نەتـەوەیی وەكـو (بەرهـەمی نەتەوە، داهاتی نەتەوە، ئاستی گشتی نرخەكان، خواست و خـستنە ڕووی هــەمووەكی ، تێكڕای بــەكاربردن و وەبــەرهێنانی هــەمووەكی ) هــەروەها لەگرفتە ئابووریەكان دەكۆڵێتەوە لەسەر ئاستی هەمووەكی وەكـو (بێكـاری و هەڵاوسان) ئەمە جگە لەوەی لەبابەتی تریش دەكۆڵێتەوە وەكو تەرازووی پارەدان (تەرازووی هاوردەنی و ناردەنی) بوودجەی گشتی (خەرجیە گشتی یەكان و دەسهاتە گشتی یەكان)..... هتد.

### جۆری دووەم – شی کردنەوەی ئابووری کەرتەکی:
### (Macro economic analysis) :

ئەم جۆرە شیکردنەوەیە تایبەتە بە توێژینەوە لە یەکە ئابوریە بچوکەکان وتاکە کەسان و ئە و هۆکارانەی کاریگەریان هەیە لە سەر بڕیارە ئابووریەکان کەیەکە ئابووریەکان دەری دەکەن. بۆ نمونە شیکردنەوەی ئاستی ( خواستی تاکەکەس، ڕەفتاری بەکاربەر، ڕەفتاری بەرهەم هێن، خستنەڕوی بەرهەمی یەک پڕۆژە، بازاڕەکان...........هتد).

### سێیەم: ڕامیاری ئابوری:

زانستی ئابوری ئامرازێکی گرنگە لەو ئامرازانەی کە پشتیان پێ دەبەسترێت لە کاتی داڕشتنی ڕامیارییە گشتییەکانی حکومەتدا . وەك باسکرا ئەرکی گرنگ و سەرەکی زانستی ئابوری ئەوەیە کە دەرئەنجامە ئابوریەکان بخاتە روو لەسەر ئەو ڕامیاریە ئابووریەی کەلەلایەن حکومەتەوە دەگیرێتە بەر، لەگەڵ زانینی ئەو ڕاستیەی پەیوەندیانەی نێوانیان، کە ئەمەش مەرجێکی پێش وەختە بۆ حوکمێکی ڕاست ودروست ، هەرچەندە بڕیاری کۆتایی دەربارەی ڕامیاری ئابوری دەشێت پشت ببەستێت بە هەندێك بۆ چوون کە لە چوارچێوەی زانستی ئابوری دەچێتە دەرەوە . بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لە ڕامیاری ئابوری ئەو چۆنێتییە کەبەهۆیەوە والە سیستەمەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن بکرێت بەشێوەیەکی باشتر کاربکەن. شیکردنەوەی ئابوریش بنەمای پێویستە بۆڕامیاریەکی ئابوری دروست.

## بەشی دووەم

# سیستەمە ئابووریەکان

### سیستەمی ئابوری – چەمکی - بنەماکانی :

سیستەمی ئابوری بریتی یە لە کۆمەڵێك رەگەزی مادی و فکری پێکەوە گرێدراو بە پێشوازێکی دیاریکراو بۆ کۆنترۆڵکردنی چالاکی ئابوری لە کۆمەڵگادا بە مەبەستی ئامادەکردنی دەرامەتی مرۆیی و سروشتی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی تاك وکۆمەڵگا.

### بنەماکانی سیستەمی ئابوری :

١- بنەمای تەکنەلۆژی سیستەمەکە.

٢- بنەمای (هزری – بیری) سیستەمەکە.

٣- لایەنی یاسایی و دامەزراوەیی.

چەمکی سیستەمی ئابوری سروشتی ژیانی ئابوریەدەردەبڕێ بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ دەربڕین سروشتی موڵکایەتی و چۆنیەتی هەڵسوڕانی دەرامەتەکان و ئاراستەو مەودای کارو کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر چالاکی یە ئابوریەکان بەشێوەیەکی تایبەتی.

جۆری موڵکایەتی و چۆنیەتی کارپێکردنی دەرامەتەکان و رادەی دەسەلاَت ودەست تێوەردانی دەوڵەت لە چالاکیە ئابوریەکاندا دەگۆڕێت بەپێی جیاوازی سیستەمەکان. هەروەها لەناو خودی یەك سیستەمدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێن. بەلاَم بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم سیستەمەکان هەوڵی چارەسەرکردنی گرفتە ئابوریەکان دەدەن. یاخود هەوڵ دەدەن دەگمەنی دەرامەتە ئابوریەکان کەم بکرێتەوە لە بەرامبەر پێداویستیە بێسنورەکان هەریەکە وبەشێوازی تایبەتی خۆی .

سـەرەڕای جیـاوازی جـۆری سیـستەمە ئابوریـەکانی نـاو کۆمـەڵگا, سەرجەم کۆمەڵگاکان ڕووبەڕووی ژمارەیەك گرفتی سـەرەکی دەبنـەوە کـە پێویـستە چارەسـەری گونجاویـان بـۆ بدۆزرێتـەوە.ئـە و گرفتانـەش لـەم خاڵانەدا خراونەتە ڕوو:ـ

١- پێویستە کۆمەڵگا بەشێوەیەك لە شێوەکان جۆروبڕی ئەو شمەك و خزمەت گوزاریانە دیاری بکات کەدەیەوێ بەرهەمیان بهێنێت واتە دەبێت ئەوە دیاری بکات کە چی و چەند بەرهەم دەهێنێت.

٢- دەبێت کۆمەڵگا ئەو شێوازە دیاری بکات کە بەهۆیـەوە شمـەك و خزمـەتگوزاری پێویـست بەرهـەم بهێنێـت دەبێـت گونجـاوترین شـێواز هەڵبژێرێت بۆ بەرهەمهێنانی سەرجەم شمەك و خزمـەتگوزاری واتـە دەبێت ئەوە دیاری بکات کە چۆن بەرهەم بهێنێت.

٣- دەبێت کۆمەڵگا شێوازی دابەش کردنـی شمـەك و خزمـەتگوزاری بەرهـەم هێنـراو دیاریبکـات وە بڕیـار بـدات ئـەو شمـەك و خزمەتگوزاریانـە بەسەر کێدا دابەش بکات.

ئەگـەر بێـت و سـەرجەم کۆمـەڵگاکان بـەجیاوازی سیـستەمە ئابووریەکانیان ئەرکی سەر شانیان بێت کە وەڵامی ئە پرسـیارانە بدەنـەوە چی بەرهەم بێت؟چەندو چۆن بەرهـەم دەهێنێـت؟وە بەسـەر کێـدا بەرهـەم دابەش بکات؟

گومانی تێدا نی یە کـەوەڵامی هـەر سیستـەمێك لـە سیـستەمێکی تـر جیاوازە لە ڕووی جۆری شمـەك و خزمـەتگوزاری بەرهـەمێنراو و بڕەکـەی و شێوازی بەرهەم هێنانەکە و چۆنێتی دابەش کردنەکـەی لـە سیـستەمێکەوە بۆ سیستەمێکی تر دەگۆڕێت, بەمانای ئـەوەی کەسیستەمەکان جیاوازیـان هەیـە.ئەمـەش بـەهۆی بـونی زیـاتر لەیـەك چارەسـەر بـۆ هـەر گرفتێك لـە گرفتـەکان.وە چارەسـەرەکانیش جیاوازیـان هەیـە بـەپێ ی سروشـتی

موڵکایەتی هۆکانی بەرهەم هێنان.ئایا جۆری موڵکایەتیەکە گشتی یە یان تایبەتی یەیان بە کۆمەڵە.هەروەها بەپێی ئامانجی ڕاستەوخۆی بەرهەمێنان سیستەمەکان دەگۆڕێن ئایا ئامانج لەبەرهەم هێنان بەدیهێنانی پڕکردنەوەی تەنها خۆیانە(الاکتفاء الذاتي) یان بەدەستتهێنانی قازانجە.یان پڕکردنەوەی زۆرترین بڕە لە پێداویستیەکانی دانیشتوان.

هەروەها چارەسەرەکان جیاوازن بەپێی رادەی دەستێوەردانی حکومەت لەچالاکی ئابوری.کە ئایا بەرفراوانە یان دیاریکراوە یان لەئاستی نێوەندایەجالەبەرئەوەی جیاوازی هەیە لەنێوان وڵاتاندا لە کاروبارانەدا بەو هۆیەوە سیستەمە ئابوریەکان جیاوازدەبن.

هەر لەپەیدابوونی مرۆڤەوە لەسەر زەوی تا ئێستا مرۆڤ بەچەندین قۆناغی پەرەسەندنی جیاوازدا تێپەڕیوە کە لەچاخەکانی پێش مێژووەوە دەست پێدەکات تا ئەمڕۆ.لە ڕاستیدا ئەو قۆناغانەی شێوەیەکی دیارو جیاوازو نەپساوە کە مرۆڤ بینیویەتی بەڵام هەر کۆمەڵگایەبەجۆرێك لە جۆرەکان ئەو قۆناغانەیان بینیوە .سەرەرای بونی جیاوازی بیر خوازان و نوسەران دا لە دیاریکردنی شێوە و ڕوخساری گشتی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی بەڵام زۆرینەی نوسەران لەسەر ئەم ڕیزبەندیە ڕێك کەوتون کە بۆ سیستەمە جیاوازەکان کراوە:

١- سەردەمی کۆمەڵگا بەراییەکان (سەرەتاییەکان).

٢- سەردەمی کۆن (کۆیلایەتی).

٣-سیستەمی دەرەبەگایەتی.

٤- سیستەمی سەرمایەداری.

٥ - سیستەمی سۆسیالستی.

گومانی تێدا نیە کە دیاریکردنی مێژووی دەست پێکردن و کۆتای پێهاتنی ئەم قۆناغانە ئاسان نیە بە تایبەتی سەردەمی کۆمەڵگا دێرینەکان.وە بارودۆخی ئابوری لە کیشوەری ئەوروبا وەك ئەوە نیە کە لەکیشوەری ئاسیاو ئەفریقیادا هەبوە.هەروەها بارودۆخی جیهانی ئەمڕۆ زۆر جیاوازە لەبارو دۆخی کۆمەڵگاکان لە مێژووی ڕابردووی چاخە کۆنەکاندا.هەروەها ژیان خۆی لە خۆیدا شەپۆلێکی نەپساوەیە کە گۆڕاوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر.

## سیستەمە ئابووریەکان:

### یەکەم: سەردەمی کۆمەڵگای سەرەتایی (سیستەمی کۆمۆنە):

#### ١- دەرکەوتنی کۆمەڵگای سەرەتایی:

کاری مرۆڤ ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە دروست بوون و پەیدابوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرەتاییدا,مرۆڤ توانی ئامێرەکانی کارکردن دروست بکات هەرچەندە لەسەرەتاوە زۆر سادە بوون ئەمەش لەبەر لاوازی مرۆڤ لەبەردەم سروشت و پێداویستی مرۆڤ بەو ئامێرانە,لەگەڵ دروست کردنی سادەترین جۆرەکانی ئامێر لە بەرد ئامێرەکانی کارکردن پەیدابوون,کار داهێنەری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بووە,ئەگەر بێتو دروست کردنی ئامێر و بەکاربردنی لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی هاوبەش بووبێت ئەوا پەیدابوونی مرۆڤیش لە هەمان کاتدا دەرکەوتنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرەتایی تۆمار کردوە بەمانای گواستنەوە لە بارێکی ئاژەڵییەوە بۆ بارێکی کۆمەڵایەتی.

#### ٢- مەرجەکانی ژیان و پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان لە کۆمەڵگای سەرەتایی :

بۆ یەکەم جار مرۆڤ داروبەردی بەکارهێناوە,لێرەوە دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشت دا دەستی پێکرد بەشێوەیەکی سست,لەسەرەتاوە ژیانی مرۆڤ پێکهاتبوو لە کۆکردنەوەی بەروبوومی دارو درەخت و ڕاو کردن بەکۆمەڵ,لەپاشان دا دۆزینەوەی ئاگر سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ مرۆڤ بەسەر سروشتدا,ئاگر مەرجەکانی ژیانی زۆر بەقوڵی گۆڕی,وە بەهۆی ئاگرەوە مرۆڤ توانی چەندین جۆر خواردن دروست بکات,هەروەها توانی ئامێری بەرهەم هێنانی نوێ دروست بکات بەتایبەتی لە بەرد لەبەرئەوە لە مێژوو دا ئەو چاخە بە چاخی بەردین ناسراوە کە هەزاران ساڵ درێژەی هەبووە. دوای ئەوە مرۆڤ فێر بوو لە کانزای خاو ئامێر دروست بکات پاشان

له برۆنز پاشان له ئاسن له دواییدا ئه‌م دوو چه‌رخه به چه‌رخی برۆنزی و ئاسنی ناسراون له پاشان دا مرۆڤ توانی ورده‌کاری له دروست کردنی ئامێره‌کاندا بکات, له‌پاشان فێری به‌خێو کردنی مه‌ڕ و مالاَت بوو (له‌سه‌رتاوه سه‌گی مالّی کرد کرد ئینجا مه‌ڕ و مانگا و بزن و ئه‌سپ مالّی کران) له پاشان دا ڕه‌شه ولاَخ وه‌ك ئامێری به‌رهه‌م هێنان وه‌كو به‌کارهێنانی گا و ئه‌سپ بۆ جووت کردن,به‌وجۆره کشتوکالّی سه‌ره‌تایی په‌ره‌سه‌ندنی به‌خۆوه بینی فێربوونی به‌کارهێنانی ئامێری کانزایی له‌لایه‌ن مرۆڤه‌وه بووه هۆی زیاد بوونی به‌رهه‌م داری کار.

له‌کۆمه‌لّگا سه‌ره‌تاییه‌کاندا مولّکایه‌تی ئامێره‌کانی به‌رهه‌م هێنان هاوبه‌ش بووه وه ئه‌م جۆره مولّکایه‌تی یه بنه‌مای په‌یوه‌ندیه‌کانی به‌رهه‌م هێنان بووه.

شێوازی کاری هاوبه‌ش و هاوکاری کردن له‌گه‌لّ ساده‌یی هێزه‌کانی به‌رهه‌م هێنان گونجاو به‌مانای مولّکایه‌تی وه‌ك پێویستییه‌ك گونجاو بووه له‌گه‌لّ ساده‌یی هێزه‌کانی به‌رهه‌م هێنان گونجاو بوون به‌مانای مولّکایه‌تی وه‌ك پێویستیه‌ك گونجاو بووه له‌گه‌لّ سروشتی هێزی به‌رهه‌م هێنان دا.هه‌روه‌ها به‌رهه‌می کاریش به‌کۆمه‌لّ بووه.مولّکایه‌تی تاکه که‌س ته‌نها ئامێره‌کانی به‌رگری گرتبوه‌وه,خه‌لّك به کۆمه‌لّی لێك دابڕاو ژیاون ته‌نها شێوازی کۆمه‌لاَیه‌تی کار شێوازی هاوکاری ساده بووه.

شێوازی دابه‌ش کردن یه‌کسانی ته‌واوبووه له دابه‌ش کردنی به‌روبومه‌کانی کاری هاوبه‌شدا ئه‌مه‌ش به‌هۆی نزمی ئاستی ئامێره‌کانی به‌رهه‌م هێنان,تاکه یاسای ئابووری له‌م سیستەمه‌دا یاسای دابین کردنی پێویسته‌کانی ژیانی مرۆڤه به پشت به‌ستنی به ئامێره ساده‌کانی به‌رهه‌م هێنان و کاری به‌کۆمه‌لّ وه شێوازی دابه‌ش کردنی یه‌کسان له‌سه‌ر بنه‌مای مولّکایه‌تی گشتی هۆیه‌کانی به‌رهه‌م هێنان.

### ٣- دابەشکردنی کار:

لەسەرەتادا تاکە دابەشکردنی کار دابەش کردنی سروشتی کار بووە لەسەر بنەمای ڕەگەز (نێر و مێ) وتەمەن (گەورە و بچوک,منداڵ و گەورە) بۆ نمونە ڕاو کاری پیاو بووە بەلاّم کۆکردنەوەی بەروبووم و کاری ناوماڵ و بەخێو کردنی منداڵ کاری ژن بووە.

یەکەم دابەشکردنی کۆمەلاّیەتی کار لەگەڵ پەیدابوونی بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵدا پەیدا بوو پسپۆریەتی لە کاردا لە ناو خودی کۆمۆنە دا دروست بوو,پەیدابوونی خێڵی شوانکارە یەکەم دابەش کردنی کاری کۆمەلاّیەتی بووە کە ئەمە بۆتە هۆی زۆر بوونی بەرهەم داری کار,گرنگترین دەرئەنجامی ئەم دابەش کردنەی کار پەیدابوون و پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕە لە نێوان خێڵی شوان کارە و خێڵی کشتوکاڵی. کە ئەمەش بووە هۆی پەرەسەندنی کۆمەڵگای کۆنی مرۆڤایەتی.

### ٤- هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان:

هۆکارە سەرەکیەکانی هەڵوەشانی ئەم کۆمەڵگەیە ئەمانەن:

١. پەیدابوونی یەکەم دابەش بوونی کۆمەلاّیەتی کار لەگەڵ پەیدابوونی بەخێوکردنی مەڕ و ڕەشەوولاّخ و کاری کشتوکاڵ.
٢. پەیدا بوون و پەرەسەندنی بازرگانی لە دەرئەنجامی یەکەم دابەش کردنی کۆمەلاّیەتی کار لە ناو خێڵە کشتوکاڵی و شوانکارەییەکان.
٣. پەیدابوون و پەرەسەندنی پیشەکان بوە هۆی سەرهەڵدانی دووەم دابەشکردنی کۆمەلاّیەتی کار (جیابوونەوەی کاری پیشەیی لە کشتوکاڵی) ئەمەش بووە هۆی ڕودانی پەرەسەندنی گەورە لە هێزەکانی بەرهەم هێناندا و زۆر بوونی زیادەی بەرهەم لەناو خێڵەکاندا.
٤. پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان کە باوبوون لە ژێر سایەی (موڵکایەتی هاوبەش، دابەشکردنی یەکسان) وای لێهاتبوو ڕێگریان دەکرد لە

پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان بەتایبەتی دوای دۆزینەوەی ئاسن وئامێرە ئاسنیەکان، بەرزبوونەوەی بەرهەمداری کار وای کرد کە لە ناو خودی یەك خێڵدا ئەو بوارە دروست ببێت کە کاری تایبەت پەیدا ببێت. لەسەر ئاستی خێزان بۆ ئەوەی ئەم جۆرە کارە وردە وردە شوێنی کاری بە کۆمەڵ بگرێتەوە ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی موڵکایەتی تایبەت.

٥. موڵکایەتی تایبەت بۆ یەکەم جار لە مەڕو ماڵاتەوە دەستی پێکرد. سەرۆك خێڵەکان یەکەم کەس بوون کە بوونە خاوەنی مەڕو ماڵات، لە دوایدا موڵکایەتی زۆربەی زۆری ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی گرتەوە، بەڵام زەوی دوای هەموو شتەکانی تر چووە ژێر رکێفی موڵکایەتی تایبەتەوە.

٦. موڵکایەتی تایبەت بووە هۆی هەڵوەشانی خێڵ بۆ خێزانی گەورە ولە پاشاندا بۆ خێزانی بچوك.

٧. موڵکایەتی تایبەت بووە هۆی رودانی گۆڕانی تەواو لە بونیادی کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بوە هۆی بەدی هێنانی بەرژەوەندی جیاواز لە ناو یەك یەکەی کۆمەڵایەتی ئابووریدا، وە بووە هۆی ئەوەی خاوەن ئامێرەکان پلەو پایەی کۆمەڵایەتی باڵا بە دەست بهێن و وردە ووردە لە کەسانی تر دا ببڕێن.

٨. پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان رێی خۆش کرد بۆ پەیدابوونی (زیادەی بەرهەم) لەبەر ئەوەی تەنها سەرچاوەی ئەو زیادەیەی بەرهەم کار بووە بۆیە بەهای کار زۆر بەرز بووەوە ئەمەش وای کرد چی تر دیلەکانی جەنگ نەکوژرێن و بکرێن بە کۆیلە بەو جۆرە سیستەمی کۆیلایەتی پەیدا بوو.

بــــەم شـــێوەیە کۆمـــەڵگای ســـەرەتایی وردە وردە لەناوچـــوو لەگـــەڵ پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگایانەدا یەکەم دابەش بوونی چینایەتی لـە کۆمـەڵگادا پەیدابوو کـە ئـەویش کۆیلـە و خـاوەن کۆیلـەکان بوون.

## دووەم/ سەردەمی کۆن : کۆمەڵگای کۆیلایەتی :

کۆمــەڵگای کۆیلایــەتی لــە ئــەنجامی دۆزینــەوەی کۆمــەڵێك ئــامێری بەرهەم هێنانی نوێدا پەیدابوو کە بوون بە هۆی بە زیاد بوونی بەرهەم داری کـار و دەرکـەوتنی دابـەش کردنـی نـوێی کۆمەڵایـەتی کـار و پەرەسـەندنی ئاڵوگۆڕ و موڵکایەتی تایبەتی ودروست بوونی چینەکان و دەوڵەت. لە ڕووی مێژوییەوە کۆیلایەتی یەکەم سیستەمی چـینایەتیە لـە هەمووشـیان تونـد و تیژ تر بووە ,کۆمەڵگای کۆیلایەتی لە هەناوی کۆمـەڵگای سـەرەتاییەوە لـە دایـك بـوو لەگـەڵ پەرەسـەندنی گـشتی موڵکایـەتی تایبەتیـدا,بـەو جـۆرە موڵکایەتی تـەنها شمەك و بەرهـەمی نەگرتـەوە بـەڵکو بەرهـەم هێنـەکانیش بوونە موڵکی تایبەتی کەسانی تـر ,دیلـەکانی جـەنگ بوونـە کۆیلـە نـەك لـە ڕووە پراکتیکیەوە بەڵکو لە ڕووی یاساییشەوە.

### ١- سەرچاوەکانی کۆیلایەتی :

کۆیلە بوون چەند سەرچاوەیەکی جیاوازی هەبووە وەکو:-

أ- دیلی جەنگ,لەوکاتەدا پـاش گـۆڕان کـاری بنـەڕەتی لـە شـێوازی ژیاندا دیلەکانی جەنگ چی تر نەدەکوژران و ڕاستەوخۆ دەکران بە کۆیلـە و لەبازاڕی کۆیلە دەکڕدران و دەفرۆشران وەك دەستکەوتی جەنگ .

ب- دامـاڵینی جوتیـارە کۆمۆنـەکان لەبنـەماکانی بەرهـەم هێنـان بـە تایبــەتی زەوی و پاشــان وردە وردە ئــەو جوتیارانــەیان کــرد بــە کۆیلــەو دەستیان گرت بەسەر هەموو موڵکەکانیان بەزەبری هێز

ج- سوو لەگەڵ بازرگانی کردن بە پارە.
د- بازرگانی کردن بە کۆیلە.

سیستەمی کۆیلایەتی گرنگترین دەزگا ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەم هێنا وەپەرەی پێداوبەکاری هێنا بۆ خزمەت کردنی پەیوەندیە کۆیلایەتیەکان, لەنێویشیاندا کەرتی شمەك,ئاڵوگۆڕ و پارە, بازرگانی فراوان, سەرمایەی بازرگانی ،سەرمایە سوو،لێك دابڕانی شار و گوند،دروستبوونی چینی بازرگان.

## ٢- چینە کۆمەڵایەتیەکان:

لەگەڵ زاڵ بوونی شێوازی بەرهەم هێنانی کۆیلایەتی کۆمەڵگا دابەش بوو بۆ دوو چینی سەرەکی:

أ- چینی ئازادەکان: ئەم چینە لەو کەسانە پێك هاتبوو کە خاوەنی هەموو مافێکی مەدەنی و ڕامیاری بوون بە تایبەتی مافی موڵکدارێتی,بەلاّم ئازادەکان لەناو خۆیاندا جیاوازیان هەبوو لە ڕووی چینایەتیەوەچونکە تەنها ژمارەیەکی کەم لەم ئازادانە خاوەنی زەوی و زاری زۆر و کۆیلە بوون کە ئەوانەش دەستەی سەردارەکان بوون کە لە لوتکەی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا بوون,بەلاّم ئەوانی تر بەرهەم هێنەری بچوك و جوتیاران و پیشەگەرەکان بوون.

ب- چینی کۆیلە: ئەمانەش ئەو کەسانە بوون کە لە هەموو مافێکی مرۆیی و ڕامیاری و مەدەنی و کۆمەڵایەتی بێ بەش بوون لە ڕووی یاساییەوە ئەمانەبەشێك بوون لەوەی پێی دەگوترا (سیستەمی موڵك) بە شمەك دانراون نەك مرۆڤ.

### ٣- قۆناغەکانی کۆمەڵگای کۆیلایەتی:

کۆمەڵگای کۆیلایەتی بە سێ قۆناغدا تێ پەڕیوە کە لە ڕووی پلەی پێشکەوتنەوە جیاوازیان هەبووە:-

أ- قۆناغی باوکایەتی: ئەم قۆناغە قۆناغی گواستنەوەیە لە نێوان کۆمەڵگای سەرەتایی و کۆمەڵگای کۆیلایەتیدا وە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە ئەوەیە کە دابەش کردنی کار و موڵکایەتی تایبەتی پەیدابووە وە جیاوازیە کۆمەلاٌیەتیەکان پەرەیان سەندووە وە سەرەتاکانی دروست بوونی دەوڵت سەری هەڵداوە بەلاٌم پەیوەندیە کۆیلایەتیەکان لە هەموو شوێنێك باو نەبووە.

ب- کۆیلایەتی پەرەسەندوو: تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە بالاٌ دەست بوونی پەیوەندی وەبەرهێنانی کۆیلایەتی و ڕێز گرتن و بەهەند زانینی جیاوازییە کۆمەلاٌیەتیەکان لە کۆمەڵگادا.هەروەها زۆربەی زۆری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کۆیلە وهەژارە ئازادەکان لەم قۆناغەدا سەری هەڵداوە.

ج- کۆیلایەتی دواقۆناغ (کۆتایی): تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە هەڵوەشانەوە و نەمانی کۆمەڵگای کۆیلایەتیە چونکە پەیوەندی بەرهەم هێنانی نوێی بەرهەم هاتنە ئاراوە لە ناو یەك کۆمەڵگادا کە زیاتر لە پەیوەندیە دەرەبەگایەتیەکان چووە.هەر لەم قۆناغە ژمارەی کۆیلەکان کەم بوەتەوە و بێگاریان (استغلال) زیادی کردوە وە ڕێگای خۆش کردوە بۆ هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلایەتی و نەمانی بە تەواوی.

## ٤- هەڵوەشانەوە و هەرەس هێنانی کۆمەڵگای کۆیلایەتی:

هۆکارەکانی هەڵوەشانی ئەم کۆمەڵگایە لەم خاڵانەدا کۆ بوەتەوە:-

**یەکەم/ هۆکارە ناڕاستەوخۆکان (هۆکارە ناوخۆییەکان):**

١- پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان زۆر سست بووە ئەم پەرەسەندنە زیاتر لە چوار هەزار ساڵی خایاندوە,بەڵام پاش بەکار هێنانی ئاسن بەشێوەیەکی بەرفراوان هێزەکانی بەرهەم هێنان پێش کەوتن.

٢- پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان نەدەگۆڕان بەتایبەتی موڵکداریەتی کۆیلە لەلایەن خاوەن کۆیلەکانەوە کە لەگەڵ پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان دا نەدەگونجا,دەبوایەئامێری نوێ بەکاربهێنرێت وەئەم کارەش هیچ بەرژەوەندی کۆیلەکانی تێدا نەبووە و بۆیە بەرهەم داری کاری کۆیلە زیادی نەکردوە بە بەردەوامیش کەمی کردوە ئەمەش بووە هۆی کەم بوونەوەی بری بەرهەم وە خراپ بوونی باری ئابووری.

٣- سیستەمی کۆیلایەتی مۆرکێکی چەوساندنەوەی داپڵۆسینی دڕندانەی هەبووە,ڕێبازی سەرکوت کردن تەنها ڕێباز بووە بۆ ناچارکردنی کۆیلە بۆ کارکردن,لە بەر ئەمەش لە سەردەمی ئەم سیستەمەدا چەندین شۆڕش و ڕاپەڕینی گەورەی کۆیلایەتی ڕوویان داوە وەکو شۆڕشی (سپارتاکۆس) ساڵانی (٧٣-٧١) پێش زایین لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی,وە ئەمەش بنەمای دەوڵەتی ڕۆمانی هەژاندوە.

## دووەم- هۆکاری ڕاستەوخۆ ( هۆکاری دەرەکی ) :

بەڵام هۆکارە ڕاستەوخۆکان کە بوونە هۆی ڕووخـانی ئـەم سیستەمە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بریتی بووە لە هێرشـە بەردەوامـەکانی خێڵـەکانی سلاڤ و جیرمان بـۆ سـەر ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی بـەڵام دوا هێـرش هێرشـی ساڵی ٤٧٦ ز بوو بەسەرۆکایەتی (ئەوریاکر) کە بووە هۆی داگیرکردنی ڕۆما و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتەکە بەیەکجاری.

بەڵام لە ڕۆژهەڵات هێرشی موسڵمانەکان لە نیوەی یەکـەمی سـەدەی حەوتەمی زاییندا سنورێکی بۆ ئەو سیستەمە دانا لە ڕۆژ هەڵات ئەمـەش بـە ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسـانی و لاواز کردنـی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی بیزەنتی.

## سێیەم- سیستەمی دەرەبەگایەتی :

دەرەبەگایـەتی سیـستەمی کۆمەڵایـەتی بەرهـەم هێنانـە,لەسـەر موڵکداریەتی زەوی لە لایەن چینی دەرەبەگەکان و وەبـەرهێنانی جوتیـاری وابەسـتە بـەو زەویـە کـشتوکاڵیانە دروسـت بـووە,پەیوەندیـەکانی بەرهـەم هێنـانی دەرەبەگایـەتی پـێش ڕووخـانی سیـستەمی کۆیلایـەتی ڕۆمـانی بـە ماوەیەك پەیدا بووە لەو کاتەدا کە ئەتیفۆندیەکان (شێوازی بەرهەم هێنـانی کشتوکاڵیی گەورە) لە سەر زەوییە کشتوکاڵیەکانی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی بڵاو بوونـەوە,شـێوازی بەرهـەم هێنـانی دەرەبەگایـەتی قۆناغێکـە خـاوەنی یاسای خۆی و پێش کەوتنی خۆیەتی لەپەرەسەندنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

### ١- سەرهەڵدان و پێکهاتنی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی:

لە قۆناغەکانی یەکەمی سەرهەڵدانی پەیوەندیـە دەرەبەگایەتیەکانـدا شـێوە سـەرەکیەکانی شـێوازی بەرهـەم هێنـانی دەرەبەگایـەتی دروسـت بـــووە.بەتایبـــەتی نیـــشانە دیارەکـــانی موڵکداریـــەتی زەوی

دەرەبەگەکان.کرۆکی پرۆسەی بڵاوبوونەوەی دەرەبەگایەتی بەشێوەیەکی گشتی لەم خاڵانەدا کۆدەبێتەوە:

أ- موڵکداریەتی زەوی لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا لە پاشانیشدا موڵکداریەتییە تاکە کەسیەکانی زەوی پاشانیش سەرجەم جۆرە جیاوازەکانی موڵکداریەتی کۆن و سەردەمی کۆیلایەتی گوێزرایەوە بۆ دەستی کەمینەیەکی ئەرستۆکراتی ئایینی و نا ئایینی بەو جۆرە موڵکداریەتی دەرەبەگایەتی پەیدا بوو.

ب- زۆرینەی جووتیارە ئازادەکان و کۆیلەکانی سەردەمی کۆیلایەتی بوون بە وەرزێر (جووتیاری وابەستە بە زەوی) ,دەرەبەگایەتی تەنها لە ئەوروپا نەبووە و بەڵکو لە ڕۆژ هەلاتیش هەبووە.

## ٢- تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی:

### أ- موڵکداریەتی زەوی لەلایەن دەرەبەگەکانەوە:

ئامرازی بنچینەیی بەرهەم هێنان لەم کۆمەڵگەیەدا زەوی بووە,موڵکداریەتی زەوی موڵکداریەکی قۆرخ کاری بووە لەلایەن دەرەبەگەکانەوە بەلام بوونی موڵکداریەتی زەوی بچوك لەلایەن جووتیارانەوە بارێکی دەگمەن بووە.

### ب- ئابووری سروشتی (ئابووری داخراو):

شێوازی بێگاری(استغلال) کاری جووتیار و وەرزێرەکان بە هۆی دەست بەسەراگرتنی کردنی بەرهەم هێنانی بچوکەوە بووە لەلایەن دەرەبەگەکانەوە,پەرت بوون و پەرش و بلاوی هێزەکانی بەرهەم هێنان ڕێگر بوو لە بەردەم پەرەسەندنی ئابووری دەرەبەگایەتی وە وای لە ئابووری دەرەبەگایەتی کردووە کە ئابووریەکی سروشتی و داخراو بێت, هەموو ناوچەیەکی دەرەبەگایەتی لە ژیانێکی ئابووری داخراو ژیاون و

ئـالوگۆڕی بازرگـانی دەگمـەن بـووە لـە نێـوان ناوچـە دەرەبەگایەتیـە جیاوازەکـان دا. و سـەرجەم پێداویـستیەکانی دەرەبـەگ و خێزانەکـەی و دەسـت و پێوەنـدەکانی و هـەموو وەرزێرەکـان لـە نـاو خـودی ناوچـە دەرەبەگیەکەدا بەرهەم دەهێنـراو دابـین دەکـرا,بـەم جـۆرە دەرەبەگـەکان سەرجەم بەرهەمە پێویستیەکانیان بۆ خۆیان دابین دەکـرد وە تـازە گـەری لە بواری بەرهەم هێناندا لەسەر بنەمای ئابووری سروشتی بوو.

ج- کۆیلەی زەوی (وەرزێر):

چالاکی کشتوکاڵی لە دەرەبەگایەتیدا لەسەر سیستەمی کۆیلایەتی بۆ زەوی بەڕێوە دەچوو.کرۆکی ئەوسیستەمە مل کەچ کردنـی تـەواوی وەرزێـر بوو بۆ دەرەبەگ و جێ بەجێ کردنی کۆمەڵێك ئـەرك بـوو.سەرچاوەی ئـەم مل کەچیەش پاشـکۆیەتی ئـەو وەرزێـرە بـوو بـۆ زەوی چ لەسـەر بنـەمای لەدایك بوون بێت یان لەسەر بنەمای مانەوەی درێژ خایەن بێـت.ئـەم جـۆرە کۆیلایەتیـە بـۆ زەوی گـۆڕا بـۆ موڵکداریـەتی زەوی و پاشـکۆیەتی بـۆ ئـەو زەویانە.

## د- موڵکانەی دەرەبەگایەتی:

موڵکانەی زەوی و زار سەند و چەندین شێوازی بەخۆوە بـینی لەگـەڵ پەرەسەندنی شێوازی بەرهەم هێنانی دەرەبەگایەتیدا , دەرەبەگایەتی سێ شێوەی موڵکانەی زەوی و زاری ناسیوە لە سێ قۆناغی جیاوازی مێـژوویی ئەم کۆمەڵگایەدا ئەوانەش:

### ١- موڵکانەی کار ( بێگار ) :

بێگـاری (اسـتغلال) وەرزێـران لەلایـەن دەرەبەگەکانـەوە هـەموو سنورەکانی بەزانـدوە بـە جۆرێـك کـە کۆمـەڵێك ئـەرکی زۆر خراوەتـە سـەر شانیان لەوانەش کاری بێگار (ئەمەش بریتیە لە ئـەنجام دانـی کـار لەلایـەن

وەرزێرەوە بۆ دەرەبەگ بەزۆرە ملێ و بێ بەرامبەر لە رێگەی بەکارهێنانی توندو تیژیەوە).

**٢ - مولّکانەی بینراو ( زیندە مالّ ):**

ئەم جۆرە وەك مولّکانەی کار وایە بەلاّم لە شێوەیەکی نوێدا ، کە پێشکەوتوو تر بوە لە شێوەی یەکەم بەلاّم شان بە شانی مولّکانەی کار هەبوە ، ئەم جۆرە مولّکانەیە لە دوا قۆناغەکانی دەرەبەگایەتیدا پەیدا بوو پاش پەرە سەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان لە ئەوروپای رۆژ ئاوا لە سەدەکانی (١٠ و١١ ) ی زاینیدا ، زیادەی بەروبومی کشتوکالّی جوتیاران و وەرزێران لەو زەویانەدا کە خۆی دەیچاند لە شێوەی سەرانەو باجدا دەیداتە دەرەبەگ.

**٣- مولّکانەی نەختینەیی :**

ئەم جۆرەش لە مولّکانە مولّکانەی بینراو بوو بەلاّم بەپارە,ئەم جۆرە مولّکانەیە بەوە لەمولّکانەی بینراو جیا دەکرێتەوە کە جووتیار لەجیاتی ئەوەی بەروبوومی کشتوکالّی بدات بەدەرەبەگ,ئەو بەروبوومەی دەفرۆشتێت و پارەکەی دەدا بە دەرەبەگ.

**٣- هەلّوەشان و نەمانی کۆمەلّگای دەرەبەگایەتی:**

هۆکارەکانی هەلّوەشان و نەمانی ئەم سیستەمە لەم خالاّنەدا کۆبوەتەوە:-

**أ- گەشەو پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان:**

لەم کۆمەلّگایەدا هێزی نوێی بەرهەم هێنان هاتنە ئاراوە کە لەسەردەمی کۆیلایەتیدا بوونیان نەبوو ئەو هێزە نوێیانەش ئەمانەن:-

١– بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی گاسنی ئاسنین و شانەی ئاسنینی کشتوکاڵی وە ئامێری لە ئاسن دروست کراوی تر.

٢– بەلأم لە بواری بەرهەم هێنانی پیشەیی دا ئامراز و ئامێرەکانی بەرهەم هێنـان بەبـەردەوامی پـەرەیان دەسـەند,وە کـاری ئاسـن توانـەوە پێشکەوتنی باشی بەخۆوە بینی شـان بەشـانی توانـەوەی کانزاکـانی تـر ئەمەش بەدروست کردنی کورەی بەرزی ئاسن توانەوە.

٣– دەرکەوتن و دروست کردنی تۆپی جەنگی لەسەدەی (١٤) دا لەگـەڵ بەکارهێنانی بارود لەجەنگەکاندا کـە ئەمـەش بـووە هـۆی پەرەسـەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنانی پیشەسازیە جەنگیەکان.

٤– پەرەسەندنی پیشەسازی ڕستن و چنین بەهۆی بڵاوبوونەوەی مەکۆکانی چنین پاش بۆیاخ کردنی قوماش,سەرجەم ئەم گۆڕانە تەکنیکیانـە بوونـە هۆی ڕوودانی گەشەیەکی گەورەی هێزی بەرهەم هینان و زۆربـوونی بـڕی بەرهەم.

## ب- دەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوایەتی:

قەیرانی ئـابووری سیستەمی دەرەبەگایـەتی خـۆی لەدابـەزینی بـڕی بەرهـەم دەبینیـەوە,سـەرەڕای چـەندین ڕاپـەڕین و شۆڕشـی جوتیـاران و بەرگری کە بووە هۆی لاوازبوونی بوونیادی ئەم سیستەمە, ئەمەش وای کرد وردە وردە ناوچـە دەرەبەگیـەکان کـەم ببنـەوە و فـەرمان ڕەوایـەتی ئەوناوچـانە گوازرایـەوە بـۆ کەسـانێکی کـەم تـر وە لەمـەوە پادشـایەتی و ئیمپراتۆریەتە بەهێزەکان دروست بوون و ئەمە بـووە هـۆی کـەم کردنـەوەی دەسەڵاتی دەرەبەگ.

### ج- دۆزینەوە جوگرافیەکان :

دۆزینــەوە جوگرافیــەکان گرنگــی گــەورەیان هــەبووە بــۆ نــەمان و لێــك هەڵوەشــانی کۆمــەڵگای دەرەبەگایــەتی ,چــونکە ئــەم دۆزینەوانــە بوونــە هــۆی پەرەســەندنی ئــاڵوگۆڕو بازرگــانی دەرەکــی ئــەوروپا و بەربەســتەکانی بــەردەم گواستنەوەی شمەك و کاڵاکانی تێك شکاند بەتایبەتی ناردنی شمەك بـۆ جیهـانی نوێ.ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی پەرەسەندنی گەورەی هێزەکانی بەرهەم هێنـان وە گوێزانــەوە لــە ئـابووری بەرهــەم هێنــان لــە دابــین کردنــی خۆبــەخۆ (الاکتفـاء الذاتي) بۆ بەرهەم هێنـان لەپێناوی بازاڕو بەدەست هێنانی قازانج.

د- هەندێك هۆکاری تریش هەبوون کاریگەریان هەبووە لەسەر نـەمان و لەناوچوونی ئەم سیستەمە بەجۆرێك لەجۆرەکان لەو هۆکارانەش:-

١- ســەردەمی بوژانــەوەی بــیری و چاکــسازی ئــایینی و کۆمەڵایــەتی بەتایبەتی لە ئینکلتەرا دوای دامەزراندنی کەنیسەی ئینگلیکـانی دروسـت بـوونی مەزهــەبی پرۆتــستانی و جیابوونــەوەی لــە کەنیــسەی کاســۆلیکی لــە ڤاتیکـان لەسەرەتای سەدەی (١٦) دا.

٢- زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان بەشێوەیەکی گەورە کە پێشتر لـە هـیچ سەردەمێکدا ئەم زیادبوونە بەم شێوەیە ڕووی نەدابوو.

### چوارەم- سیستەمی سەرمایەداری :

سەرەتاکانی دروست بوونی سیستەمی ســەرمایەداری لــە ســەدەکانی (١٤ و ١٥) ی زایینیدا سەری هەڵدا لەشارەکانی باکووری ئیتالیـا و هەنـدێك بەشی زەوییە نزمەکان (هۆڵەندا) لە کاتێکدا هێشتا لـە زۆربــەی ناوچـەکانی ئــەوروپا لــە ســەرەتای ســەدەی (١٦) ی زاینیــەوە دەســتی پێکــردوە,لــە ســــەرەتاوە ســــەرمایەداری وەك پێکهاتەیــــەکی ئــــابوری و کۆمەڵایــــەتی دەرکەوت,پەیدا بونی سەرمایەداری نەمانی دەرەبەگایەتی بە لـە ناوچـوونی کۆیلایەتی زەوی و کرێکاری بێگاری(سوخرە) لە ئینگلترا یەکەم جار پاشان لە فەرەنسا و ئیتالیا و هۆلەندا بە تەواوی ڕوون بوەتەوە.

### ١- بنەما سەرەكیەكانی سیستەمی سەرمایەداری:

نمونەی بیردۆزی سیستەمی سەرمایەداری یان (ئابوری بازاری ئازاد) ئەوەیە كە دەبێت ئازادی موڵكداریەتی تایبەتو ئازادی لە هەڵس و كەوتی ئابوری دا هەبێت لە سەرجەم بوارەكانی بەرهەم هێنانو بەكاربردن و پاشەكەوت دا، لە سەر ئەم پێودانگانە دەزگاكانی ئەم سیستەمە موڵكایەتی تایبەتیو، سیستەمی میراتو كێ بڕكێو پاڵنەری قازانجو ئازادی ئەنجامدانی چالاكییە ئابوریەكانو، میكانیزمی نرخ، دەگرنە خۆ:

#### ا- موڵكایەتی تایبەت:

موڵكایەتی تایبەت گوزارشتە لە مافی خاوەنداریەتی و بەكارخستنی سامانە بە مەبەستی بەدەسهێنانی داهات، موڵكایەتی تایبەت لە شمەكی بەرهەم هێنانو شمەكی بەكاربردن و سەرمایەی نەختینەیی پێك دێت و دورست دەبێت موڵكایەتی تایبەت بنەماكانی بەرهەم هێنان دەكاتە هۆی خولقاندنی فەرمانەكانی كۆمەڵایەتی كە خۆی لە لا مركزیەتو دەركردنی بڕیارەكاندا دەبینێتەوە لە ڕێگەی دابەشكردنی سامانو داهاتەوە. لە گەڵ بوونی هاندەری تایبەت بە كۆ كردنەوەی سامانو فەراهەم كردنی دڵنیایی مادی بۆ تاكەكانی كۆمەڵ.

#### ب- كێبڕكێو پاڵنەری قازانج:

ئەمەش بە مانای بونی كێبڕكێ لە نێوان كەسەكاندا بە ئامانجی زیادكردنی خۆش گوزەرانی ئابوری، كێبڕكێ گرنگیەكی گەورەی هەیە لە سیستەمی سەرمایەداریدا چونكە پاڵنەرەكانی بەرهەم هێنان لە ژێر سایەی ئەم سیستەمەدا بەندە بە ئارەزووی تاكەكەس بۆ چاككردنی باری ماددی خۆیو بەدەست هێنانی خۆش گوزەرانی وە بەم پاڵنەرەش دەوترێ (بەرژەوەندی تاكەكەس).

### ج- ئازادی چالاکیە ئابوریەکان:

بە مانای تاکەکەس ئازادە لە هەڵبژاردنو دیاری کردنی ئەو پیشەیەی دەیەوێت ئەنجامی بدات وە خاوەن سەرمایە ئازادە لە وەبەرهێناندا لە هەر جۆرە چالاکیەکی ئابوریدا بێت، ئەمەش کرۆکی ئازادی چالاکیە ئابوریەکانە.

### د- میکانیزمی نرخ:

ئەمەش مانای کۆنترۆڵ کردنی چالاکی ئابوری لە ڕێگەی دەزگای نرخەوە دەبێت کە هەڵدەستێت بە گونجاندنی بڕیارەکانی بەکاربەران و بڕیارەکانی بەرهەم هێنەکان بە جۆرێك کە شمەکی بەرهەم هێنراو دەبێت بە دیهێنەری ئارەزوەکانی بە بەکاربەران بێت. ئەگەر هاتوو بەکاربەران زیاتر روویان کردە شمەکێكو خواست زیادی کرد ئەوا نرخی ئەو شمەکە بەرز دەبێتەوە دەبێتە هۆی زۆر بونی قازانجی بەرهەم هێنەرەکان ئەمەش بەرهەم هێنی دیکە هان دەدات بۆ ئەوەی هەمان ئەو شمەکە بەرهەم بێنن بەم جۆرە خستنە روو زیاد دەکات بەمەش نرخەکەی نزم دەبێتەوەو قازانجی بەرهەم هێنەکان کەم دەبێتەوە بۆیە ئەوانیش بەرهەم کەم دەکەنەوە هەتا وەکو بازاری ئەم شمەکە جۆرێك لە هاوسەنگی نرخی بۆ پەیدا دەبێت، واتە نرخەکەی ئەوەندە بەرز و نزم نابێتەوە و جێگیر دەبێت
.

### ٢- رۆڵی سەرمایەداری بازرگانی لە دورست بوونی سیستەمی سەرمایەداریدا :

سەرمایەداری بازرگانی رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە هەڵوەشانی دەرەبەگایەتی و دروست بوونی پەیوەندی سەرمایەداری, وەگوێزانەوە لە بەرهەمهێنانی شمەکی سادەوە بۆبەرهەمێنانی شمەکی سەرمایەداری.رۆڵی

سەرمایەداری بازرگانی خێرا کردنی پرۆسەی نەمانی ئابوری سروشتی و دارمانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بووە,هەروەها رۆڵی گرنگی هەبوە لە کەڵەکەبوونی شمەکی پیشە گەرەکان بە دەستی بازرگانەکان بەم جۆرە سەرمایەداری بازرگانی ئاسان کاری کرد بۆ دروست بوونی بازارێکی نیشتمانی و جیهانی.وە پرۆسەی نەمانی کاری پیشەگەری و بەرهەمە بچوکەکانی خێراتر کرد.

بەشێوەیەکی گشتی سەرمایەداریی بازرگانی بە چەند قۆناغ و بارودۆخێکدا تێپەریوە کە بریتین :

أ- هەستانی بازرگانەکان بەکرینی ئەوشمەکانەی کە لەلایەن بەرهەم هێنەرەکانەوە بەرهەمهێنرابوون وەفرۆشتنەوەی لەبازاردا ئەم قۆناغە قۆناغی قۆرخ کردنی کرین بوە.

ب - قۆناغی تێکهەڵچوونی کاری ناوەند گیری (الوسیطة) بۆ کرینی بەرهەمی ئامادە و فرۆشتنی لەگەڵ پێدانی قەرز بە بەرهەم هێنەکان بە نرخی سوود و بە پێی مەرجی زۆر توند.

ج - بازرگانەکان کەرەسەی خاوی پێویستیان دەدا بە پیشەگەرەکانیان وە پیشەگەرەکانیان لەبازاری فرۆشتن و بازاری کرینی کەرەسەی خاو، وە خۆیان سەپاند و کۆنترۆڵی بازاری فرۆشتنی شمەکی ئامادەکراویشیان کرد.

د - لە پاشاندا بازرگانەکان هەستاون بە دابەش کردنی کەرەسەی خاو بەسەر پیشەگەرەکان دا لەماڵەکانی خۆیاندا,بەم جۆرە سەرمایەی بازرگانی پیشەگەرکانیان کرد بەکرێکار و بەکرێ کاریکەن لەسەر داخوازی بازرگانەکان بە ئامێر و کەرەسەی خاوی بازرگانەکان.

ئەو ماوەیەی کە تیایدا کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی دارماو پەیوەندیە سەرمایەداریەکان پەیدا بوون بەماوەی (کەڵەکە بوونی سەرەتایی سەرمایە)

ناسراوە,هۆکارەکانی ڕوودانـی پرۆسـەی کەڵەکـە بـوونی سـەرمایە هۆکـاری ناوخۆیی و دەرەکی بوون.

هۆکارە ناوخۆییەکان بریتیە لە پاشەکەوتی ناوخۆیی ئەمـەش بریتیـە لە دانانی بەشێك لە داهات بۆ پاشـەکەوت کـردن وەخـەرج کردنـی لـەبواری وەبـەرهێنان دا. بـەلاَم هۆکـارە دەرەکیـەکان زیـاتر کـارە بـەتالاَن بردنـی دەرامەتی سروشتی و مرۆیی بووە لە جیهـانی نـوێ (بازرگـانی سـێ گۆشەـ بازرگانی کۆیلە),تەنها بۆ نمونە ئیسپانیا بەتەنها لە نێوان سـالآنی (١٥٢١–١٦٦٠) هەزار تـەن زیو و دووسەد تـەن زێریان لـە ئـەمریکای لاتـین بـە تـالآن بردوە.

## ٣– قۆناغەکانی پەرەسەندنی سەرمایەداری:

لــە ڕێــڕەوی پەرەســەندنی خۆیـدا سیـستەمی ســەرمایەداری ئــەم قۆناغانەی دیوە:

### أ– هەرەوەزی سەرمایەداری سادە:

لەم قۆناغەدا کۆمەڵێك کەس بەیەکـەوە هەڵدەسـتن بـە ئـەنجام دانـی کار بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بەئەنجام دانی یەك کـار یـان چـەند کارێـك کـە دەشـێت جیـاواز بـن بـەلاَم پەیوەنـدیان بەیەکــەوە هــەبووە. هاوکـاری سەرمایەداری سادە یەکەم قۆناغە لە پەرەسەندنی سـەرمایەداریدا.وەخـاڵی دەسـت پـێ کردنـی بەرهـەم هێنـانی سـەرمایەداریە. قۆنـاغی هاوکـاری پەرەسەندنێکی مێژوییە وەك دژێك بۆ ئابووری کشتوکاڵی و بەرهەم هێنانی پیشەیی تاکە کەس,وە ئەمەش لە بەرهەم هێنانی بچوکی پەرش و بـلاَوەوە دروست بوە.

دەزگا پیـشەسازیە سـەرمایەداریەکان لەسـەرەتاوە بـە یـەك شـت لـە دەزگای بەرهەم هێنی بچوك جیاکراوەتەوە ئەویش ژمـارەی ئـەو کرێکارانـە

بووه له وەرشەی پیشەسازیدا زیاتر بووه لەوەرشەی بچوك. له هەرەوەزیەکاندا لەسەرەتاوە دابەش کردنی نەبووە,هەموو کرێکارەکان هەموویان هەستاون بە ئەنجام دانی هەمان جۆرکار,بەلآم بەرهەم داری زۆر زیاتر بووه له بەرهەم داری کاری پیشەگەری.

لەسەر ئەم بنەمایە هەرەوەزکاری سەرمایەداری سادەبووە هۆی:

١. زۆربوونی بەرهەم داری کار.
٢. کەم کردنەوەی ماوەی کاری پێویست بۆ بەرهەم هێنانی شمەك.
٣. کەم کردنەوەی تێچوونی بەرهەم هێنان و بەرزبوونەوەی قازانج .
٤. کەم بوونەوەی کرێی کرێکار و زۆربوونی قازانج.
٥. دابڕانی کار و سەرمایە لە یەك.

### ب- قۆناغی بەرهەم هێنان له کارگە دەستیەکان (مانیفاکتۆر) و دابەش کردنی کار:

ئەم قۆناغەی مانیفاکتۆری بەرهەم هێنانە لە ناوەڕاستی سەدەی (١٦) ودەست پێ دەکات تا سەدەی (١٨) ی خایاندوە. مانیفاکتۆر بریتی یە لەو جۆرە هەرەوەزیەی کە لەسەر بنەمای دابەش کردنی کار و پسپۆری لە پرۆسەی بەرهەم هێنان دا وەستاوە ئەم قۆناغەبریتی یە لە ئەلقەیەکی نێوان پیشەگەری و بەرهەم هێنانی شمەکی بچووك لەلایەك و پیشەسازی ئامێری قورس لەلایەکی تر.

بەلآم بنەمای تەکنیکی مانیفاکتۆر بریتی بوو لە پیشەی دەستی ،هەر ئەمەش وای لێکردووە کە نزیك بێت لەوەرشەی بچووك. مانیفاکتۆر دابەش بووە بۆ دووجۆرە: (جۆری لێك چوو) و(جۆری جیاواز) لە جۆری یەکەم دا بەرهەم بەچەند پرۆسەیەکی یەك لە دوای یەك وپێکەوە گرێدراو دا دابەش بوە وە کار دابەش دەکرێت ,بەلآم لەجۆری دووەمدا دابەش کردنی کار

دابەش کراوە بەسەر کرێکاراندا وە ئەم بەشانە هەموویان یەك بەرهەمی ئامادە دروست دەکەن.

لە بەرهەم هێنانی مانیفاکتۆرەدا کاری بیری و کاری بازوو لە یەکتر جیابوونەوە. لەگەڵ دروست بوونی زنجیرەیەك لە ڕیزبەندی کارگێڕی.گرینگی مێژووی ئەم قۆناغە لەوەدایە کە ڕێگا خۆشکەر بوە بۆ گواستنەوە بۆ قۆناغی پیشەسازی میکانیکی.

### ج- قۆناغی بەرهەم هێنانی پیشەسازی میکانیکی:

بەرهەم هێنانی شمەك بەهۆی ئامێرە میکانیکیەکانەوە قۆناغی سێهەمە لە پەرەسەندنی سەرمایەداری. هێزی کار لەم مانیفاکتورەدا خاڵی وەرچەرخان بوە لە شێوازی بەرهەمهێناندا وشێوازەکانی کاریش هەمان ڕۆڵیان بینی لە پیشەسازی قورس دا. شۆڕشی پیشەسازی لەگەڵ داهێنانی ئامێردا بلاْبوەوە,ئامێرەکانی بەرهەم هێنان لە سەرەتاوە لەلایەن مرۆڤەوە یان با یان گیانەوەرەوە هەڵسوڕاوە بەلاْم دروست کردنی ئامێری هەڵمین شۆڕشێکی گەورەی میکانیکی جوڵە بوو.لەم قۆناغە قۆناغی بەرهەم هێنانی پیشەسازی قورس دا سەرمایەداری بە تەواوەتی بە سەر دەرەبەگایەتیدا زاڵ بووە.

### د- قۆناغی شۆڕشی پیشەسازی و کەڵەکەبوونی سەرمایە:

سەراپای سەرمایە زیادی کردووە لە کاتی کەڵەکە بوونی سەرمایەدا لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەم پێکهاتەکانی سەرمایە چۆتە ژێر ڕکێفی کۆمەڵێك گۆڕانکاری نا هاوسەنگەوە. ئەمەش بۆتە هۆی ڕوودانی گۆڕان لە پێکهاتەی خودی سەرمایە خۆیدا.شۆڕشی پیشەسازی و پێشکەوتنی تەکنیکی بووە هۆی گەشەکردنی بەشێکی سەرمایە ئەویش ئامرازەکانی بەرهەم هێنان (ئامێرەکان,ژێرخان,کەرەسەی خاو,..... هتد) یان سەرمایەی نەگۆڕ بەلاْم

سەرمایەی خەرج کراو بۆ کرینی هێزی کار بەهێمنی پەرەی سەندوە, پەیوەندی نێوان سەرمایەی نەگۆڕ و سەرمایەی گۆڕاو پێی دەوترێت پەیوەندی ئۆرگانیکی یان پێکهاتەی ئۆرگانیکی سەرمایە.

پێکهاتەی ئۆرگانیکی سەرمایە لە پیشەسازیەکەوە بۆ پیشەسازیەکی تر دەگۆڕێت چونکە تا ئامێر گەورەتر بێت لە بەرامبەر ژمارەی کرێکاردا ئەوا پێکهاتەکە بەرزتر دەبێتەوە و تا ببێت ئەوا پێکهاتەی ئۆرگانی سەرمایە زیاد دەکات,واتە سەرمایە گۆڕاو (کرێکار) کەم دەکات بەلاَم سەرمایەی نەگۆراو زیاد دەکات قەبارەی سەرمایە زیاد دەکات لە کاتی پرۆسەی تازەکردنەوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداریدا لە ئەنجامی کۆبوونەوەی سەرمایە و کەڵەکەسەندنی.ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێت کۆبوونەوە و کەڵەکەسەندنی سەرمایە.ئەم کارە لە بنچینەدا گەشەی سەرمایەیە لە ئەنجامی لێکدانی سەرمایەی بچوك لە یەك سەرمایەی گەورە دا وە ئەم کارەش لە رێگەی دروست کردنی کۆمپانیای ئاسایی و هاوبەشەوە بووە.

## ه- قۆناغی قۆرخ کاری وئیمپریالیزم:

ئەم قۆناغە لە سالاَنی حەفتاکان وهەشتاکانی سەدەی (١٩) دا پەیدا بوو بەردەوام بووە لەگەڵ کۆمەڵێك گۆڕانکاری گەورەدا تا کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم.ئەم قۆناغە ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

١. لێکدانی سەرمایەداری پیشەسازی و سەرمایەداری بانکی (بازرگانی) ودروست بوونی سەرمایەداری دارایی لێکەوتەوە.

٢. پەیدابوونی کۆمپانیای گەورەی قۆرخ کاری (مۆنۆپۆل)لەگەڵ دروست بوونی گەلەکۆمەکی ئابووری وەك (کارتێل,ترست,کۆنستیۆمی نێودەوڵەتی).

٣. بلاَوبوونەوەی کۆمپانیای فرە نەتەوەو فرە ڕەگەز بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

٤. دووبارە دابەش کردنەوەی سەرچاوەی کەرەسە خاوەکان لە نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارە گەورەکان دا.

### و- قۆناغی جیهان گیری:

ئەمە دوا قۆناغە کە تائێستا سەرمایەداری پێی گەیشتوە لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم دا ئەمەش لەگەڵ ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و نەمانی جەنگی سارد و سیستەمی دوو جەمسەریدا پەیدا بووە,هەروەها لەگەڵ لەناوچوونی شێوازی سەرمایەداری دەوڵەت و نەمانی سیستەمی سۆشیالیزمی سۆڤیەتیدا هاتە ئاراوە.بەلاَم لە ڕووی ئابووریەوە شێوازی وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆ لە وولاَتانی تازە پێگەیشتوو بلاَوبووەوە لەگەڵ بالاَ دەستی سەرمایەداری دارایی و کۆمپانیای گەورە و پەرەسەندنی بازرگانی ئەلکترۆنیدا.

## پێنجەم – سیستەمی سۆشیالستی ( هاوبەشی – الاشتراکي ):

چەمك وتایبەتمەندییەکانی سیستەمی سۆشیالستی :

سۆشیالستی وەك سیستەمێکی ئابووری ئەوە دەگەیێنێت کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان موڵکی کۆمەڵگایە وکۆمەڵگا لە پێناو بەدیهێنانی پێشکەوتنی خۆی دەیان خاتە کار ،پرۆسەی بەرهەم هێنان لەسایەی پلاندانانێکی زانستیانەی سەرتاپاگیری (سەرتاسەری) دەبێ و بەجۆرێکی ئەوتۆ ئاڕاستە دەکرێ کە لەگەڵ پێداویستی کۆمەڵگادا بگونجێ .

ڕامیاری تایبەتیش پیادە دەکرێ لە دابەشکردنی داهاتی نەتەوەیی لە سەر بنچینەی داد پەروەری کۆمەلایەتی و بەرەنگاربوونەوەی قۆرخ

کردن ونەهێشتنی هۆیەکانی جیاوازی نێوان داهات وسامانی تاکە تاکەی خەڵك.

دەوڵەتیش لە سایەی ئەم سیستەمەدا کار دەکات بۆ ڕێکخستنی بەرهەم هێنان بەشێوەیەك بەرژەوەندی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگا بەدی بێنێت لەڕێگای خاوەندارێتی کۆمەڵگا بۆ هۆیەکانی بەرهەمهێنان وچاودێری کۆمەڵگا لە سەر بەرهەمهێنان ودابەشکردن.

## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی سۆشیالستی :

### ١ – ئامرازەکانی بەرهەمهێنان موڵکی گشتییە:

ئەم تایبەتمەندییە لە هەموو تایبەتمەندییەکانی تری سیستەمی سۆشیالستی گرنگترە،چونکە لەم سیستەمەدا موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان،لە جیاتی ئەوەی موڵکی تایبەتی سەرمایەداران بێ ،بەڵکو دەبێ موڵکی گشتی (دەوڵەت) بێت.

ئامانجی ئەم گۆاستنەوەی موڵکایەتییەش بۆ ئەوەیە یەکسانی کۆمەڵایەتی بێنێتە دی ،وهەموو شێوازەکانی قۆرخ کردن بنبڕ بکات.

### ٢ – پلاندانانی ناوەندی (مەرکەزی) سەرتاپاگیری :

سیستەمی سۆشیالستی شێوازی پلاندانانی ناوەندی پەیڕەودەکات،بۆ چالاکییە ئابوورییەکان بۆ بەدی هێنانی ئامانجە ئابوورییە دیاری کراوەکان،کە لە ناوەندەوە لایەن دەوڵەتەوە نەخشەی بۆکێشراوە،هەر لە ڕێگای ئەم پلاندانانەوە و وەبەرهێنانی دەرامەتی نەتەوەیی بە باشترین شێوە دەکرێت کە خۆش گوزەرانی میللەت وبنیات نانی گەشەکردنێکی هاوسەنگ بۆ لقە جۆر بە جۆرەکانی ئابووری بەدیبێنێ

٣- دادپەروەری لە دابەش کردنی داهات وسامان:

سیستەمی سۆشیالستی لە دابەش کردنی داهاتی نەتەوەیدا ڕەچاوی ئەوە دەکات کە بە شێوەی دادپەروەرانە بەسەر تاکەکانی میللەت دابەش بکرێت، وجیاوازی داهات وسامان لە نێوان تاکەکان نەمێنێت،ئەم تایبەتمەندیەش لە بنەرەتی موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە هەڵقوڵاوە،واتا داهاتی

نەتەوەیی لە سایەی سیستەمی سۆشیالستیدا بە پێی رەخساندنی هەلی یەکسانی کار وگوزەران دابەش دەکرێت ، بەمەش دیاردەی جیاوازی لەدابەش کردنی داهات وسامان دەرناکەوێت .

٤ – داد پەروەریی کۆمەڵایەتی ویەکسانی هەل (تکافؤ الفرص):

مەبەست ئەوەیە هەل ومەرجێکی ئابووری وکۆمەڵایەتی ئەوتۆ بڕەخسێت، کە هەلی یەکسانی چۆنێەتی کارکردن و ژیان و خۆش گوزەرانی بۆ هەموو تاکێك دابین بکرێت. واتە هەموو تاکێك هەلی کارکردن و فێربوون و دابەش بوونی سەرجەم داهاتی بەیەکسانی بۆ بڕەخسێ.

# بەشی سێیەم

# بیردۆزی خواست و خستنە ڕوو

# DEMAND & SUPPLY

## پێشەکی:

بازاڕ ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە ژیانی ئابووری کۆمەڵگاکاندا بێ ئەوەی ڕەچاوی ئاستی پێشکەوتنی ئابووریان بکرێت. بە تایبەتی ئەو کۆمەڵگایەی کەوا سیستەمی ئابووریان بازاڕی ئازادە وە یان تێکەڵاوە. پێیان وایە گرفتە ئابووری یەکان لە میانەی سیستەمی بازاڕەوە چارەسەر دەکرێت, وە بازاڕ دەزگایەکی سەرەکیە بۆ دیاری کردنی چەندایەتی و چۆنایەتی شمەك ، و ئەم خزمەت گوزاریانەی کەرتی کارەکان ئارەزووی بەرهەم هێنانیان هەیە، لەگەڵ چۆنیە تی دابەشکردنیان ، هەروەها بازاڕ نرخی بنەما بەرهەم هێنە بەشداربووەکان لە کرداری بەرهەم هێنانیدا دیاری دەکات.

لە بازاڕدا نرخەکان دیاری دەکرێن بە هۆی ئاوێتەبوونی هێزەکانی خواست و خستنە ڕووی شمەك و خزمەت گوزاریەکان, چونکە بەهای شمەك وە یان خزمەت گوزاری بەندن بەم کەڵکەی کە بەکاربەر بەدەستی دەهێنێت ئەمە لەلایەك, وە تێچوونی بەرهەم هێنانی لە لایەکی ترەوە .

## پێناسەی بازاڕ:
## Definition of market

بازاڕ ئەو شوێنەیە کە ئەم دوولایەنەی تێدا کۆدەبێتەوە : کریاڕ ((ئەو بەکاربەرەی شمەك خواستی بۆ شمەکەکە هەیە, ئەوەش لایەنی یەکەمی بازاڕە)) وە فرۆشیار ((ئەو بەرهەم هێنەی شمەك کە شمەکەکەی دەخاتە ڕوو))ئەوەش لایەنی دووەمی بازاڕە ))هەر لایەنێکیان کرداری ئاڵو گۆڕ ئەنجام دەدەن, بەکاربەر شمەکەکە بە دەست دەهێنێت بەڵام بەرهەم هێن نرخی ئەو شمەکە بەدەست دەهێنێت .

> **بازاڕ:**
> چوار چێوەیەکە کۆمەڵێك لە کریار و فرۆشیار بەخۆوە دەگرێت و پەیوەندیەکی پتەو لە نێوانیان دا هەیە و ئاڵوگۆڕ دەکرێت بەبێ بەربەست.

بۆیە کاتێ بەکاربەر بریار دەدات شمەکێکی دیاری کراو بەدەست بهێنێت دەچێتە ئەو شوێنەی ئەم شمەکەی لێ دەفرۆشرێت ((بازاڕی شمەك)) بۆ نمونە بازاڕی پۆشاك , بازاڕی ئۆتۆمۆبێل , بازاڕی ئامێرە ئەلیکترونیە کان....هتد

## پانتایی بازاڕ:

ئەوەی پێویستە تێبینی بکرێت بازاڕ بەند نیە بە شوێنێکی دیاری کراو، زۆر جار گوێ بیستی بازاڕەکان دەبین بەڵام شوێنێکی دیاری کراوی نیە وەك بازاڕی ((نەوت و زێری جیهانی)) هاوکات زۆر لە بازاڕەکان پێویست بەوە ناکەن فرۆشیار ((بەرهەم هێن)) کریار ((بەکاربەر)) پێك

بگەن بۆ ئەنجامدانی کرداری کڕین و فرۆشتن بۆ نمونە ئاڵوگۆڕ کردن لە ڕێگای تۆڕی ئینتەرنێتەوە.

**پانتایی بازاڕ:**
بازاڕی ناوخۆیی (بازاڕی هەولێر) بازاڕی هەرێمایەتی (بازاڕی هەرێمی کوردستان) بازاڕی جیهانی (بازاڕی لەندەن).

### ئەو هۆکارانەی پانتایی بازاڕ دیاری دەکەن:

١-سروشتی شمەکەکە.

٢-داب و نەریت.

٣-ئاسانکاری گەیاندن.

٤-بەربەستە گومرگیەکان.

### ڕەگەزەکانی بازاڕ :

١- بوونی شمەکێك یان خزمەت گوزاریەك بۆ فرۆشتن بخرێتە ڕوو وبتوانرێ ئاڵوگۆڕی پێ بکرێت .

٢- بوونی خواست لە لایەن کڕیارانەوە بۆ ئەم شمەك یان خزمەت گوزاریە.

٣- دیاری کردنی نرخێکی دیاری کراو بۆ شمەکەکە بەهۆی ئاوێتەبوونی هێزەکانی خواست و خستنە ڕوو .

٤- ئازادی بێ بەربەستی بەیەك گەیشتنی نێوان لایەنە ئاڵوگۆڕەکاندا لەبازاڕ .

# خـواســـت
# DEMAND

خواست :بريتى يه له لايەنى يەكەم له بازاڕدا, ئەم رۆڵه بەكاربەر پێى هەڵدەستێ بۆ خواستى شمەك وخزمەت گوزاريە جۆربەجۆرەكان وه بەرامبەر نرخى هەر شمەكێك كەلەوانەيه بەكار بيكڕێ برێكى ديارى كراو هەيه ، كه بەكاربەر نيازى خواست و كڕينى هەيه.

واتاى خواست:

تەنها ئارەزووى بەكاربەر نايەت بۆ بەدەست هێنانى شمەكێك. بەڵكو ئەم ئارەزووه دەبێ پشت بەست بێت به توانستى كڕينيەوه.

| **خواست:** |
|---|
| بريتى يه لەو ئارەزوو توانستەى بۆ بەدەست هێنانى بڕه ديارى كراوەكان له شمەك و خزمەتگوزاريەكان به نرخێكى ديارى كراو وه له ماوەيەكى ديارى كراو. |

لەم پێناسەدا تێبينى دەكەين ، خواستى بە كردار كۆمەڵێك لە بنەماكان به خۆوه دەگرێت كه ئەمانەن:-

أ- پێويستى و ئارەزوو : پێويستى مرۆڤ لە ئارەزوويدا يه بۆ بەدەست هێنانى شتومەكه بەكەڵكەكان چونكه ئارەزوويەكى پێويستى پڕدەكاتەوه.

ب- توانستى كڕين: واتا توانست له پێدانى نرخى ئەو شتەى كەڵكى لێوه دەبينێت.

ج- نرخى شمەكەكه ديارى كراو بێت.

د- كردارى كڕين له ماوەيەكى ديارى كراودا ئەنجام بدرێت.

پێویستە ئەم بنەمایانە پێکەوە کۆبکرێنەوە وە ئەگەر بەدی نەکران ئەوابە خواستی بێ کردار ناودەبرێت.

**خشتەی خواست:**

بریتی یە لەو بڕە خواستەی شمەکێك کاتێك نرخەکەی دەگۆڕێت (نرخە جیاوازەکان، لەماوەیەکی دیاری کراودا وە لە بازاڕێکی دیاری کراودا).

خشتەی خواست بۆ شمەکێك لەکاتێکی دیاریکراودا

| نرخ (ن) | بڕی خواست ب. خو |
|---|---|
| ٢ | ١٠٠ |
| ٤ | ٨٠ |
| ٦ | ٦٠ |
| ٨ | ٤٠ |
| ١٠ | ٢٠ |

پێویستە تێبینی بکرێت کەوا خشتەی خواست جیاوازە لە شمەکێك بۆ شمەکێکی کە، وە جیاوازە لە هەمان شمەکدا لە ماوەیەك بۆ ماوەیەکی کە.

**یاسای خواست:** Law of Demand

پەیوەندیەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان نرخی شمەکێك و بڕی خواستەکەی, چونکە هەرچەند نرخی شمەکێك لە بازاڕدا بەرز بێتەوە ئەوا بڕی خواستەکەی دادەبەزێت.بەپێچەوانەشەوە هەرچەند نرخی ئەو شمەکە دابەزێت ئەوا بڕی خواستەکەی زۆرتر دەبێت لەلایەن بەکاربەر لەگەڵ مانەوەی هۆکارەکانی تر بەنەگۆڕانی.

## چەماوەی خواست: Demand Curve

وێنەیەکی خشتەی خواستە ، کە پەیوەندی نێوان بڕی خواست و نرخە جیاجیاکانی شمەك نیشان دەدات ، لە ماوەیەکی دیاری کراودا وە لە بازاڕێکی دیاری کراودا وە پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە چەماوەی خواست لە شمەکێك بۆ شمەکێکی تر جیاوازە.




**وێنەی چەماوەی خواست**

| چەماوەی خواست : خشتەی خواستە بە شێوەی داتاوە |
|---|

**خەسڵەتەکانی چەماوەی خواست:**

**١- بۆ خوارەوە لار دەبێتەوە.**

**٢- ئاراستەکەی لەلای چەپەوە بۆ لای راستە .**

**٣- لە خاڵی بنەڕەت دا کوڕ(محدب) خۆی نیشان دەدات.**

بۆ ئەوەی چەماوەی خواست نیشان بدرێت پێویستە ئەمانەی خوارەوە بزانرێت.

١- تەوەری ستوونی بریتی یە لە نرخ، وە تەوەری ئاسۆیی بریتی یە لە بڕ.

٢- چەماوەی خواست لاریەکەی نێگەتیڤە بەهۆی پەیوەندی پێچەوانەی نێوان نرخ و بڕی خواستەکەی لە شمەکێکی دیاری کراودا.

٣- چەماوەی خواست ڕەنگ دانەوەی حاڵەتێکە لە ماوەیەکی کورت خایەندا ، وە شێوەی چەماوەکە دەگۆڕێ لەگەڵ گۆڕانی ماوەکان.

٤- هەر خاڵێك لەسەر چەماوە ، بە مانای بەرزبوونەوە یان نزم بوونەوەی بڕی خواستە لە شمەکێکدا ئەگەر هاتوو نرخەکەی بگۆڕێت (لەگەڵ گریمانی نەگۆڕانی هۆکارەکانی تردا).

## ئەو هۆكارانەی كە خواست دیاری دەكەن
## DETERMINANTS OF DEMAND

هەروەك ووتمان پەیوەندی نێوان بڕی خواست بۆ شمەكێكی دیاری كراو و نرخی ئەم شمەكە پێچەوانەیە، كە ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی هەرچەندە نرخ دابەزێت ئەوا بڕی خواست زۆرتر دەبێت بەڵام ، بە گریمانی نە گۆڕانی هۆكارەكانی تر كە كاردەكەنە سەر بڕی خواست, كەواتە ئەم هۆكارانەچین و كاردانەوەیان چی یە لەسەر خواستی شمەك؟

### ١- ژمارەی كڕیار یان بەكاربەر: Number of buyers

گریمان هۆكارەكانی تر نەگۆڕ بوون, ئەوا خواست لەسەر شمەكە جۆربەجۆرەكان زۆرتر دەبێت بە دەركەوتنی بەكاربەری نوێ بۆ شمەكەكان، ئەوش بەهۆی:

ا- كاریگەری پروپاگەندە و ڕێكلامەكان .

ب- زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان ئەگەر زیادەكە بەهۆی لە دایك بوونە نوێیەكان بوون ئەگەری زیادبوونی خواست لەسەر پۆشاكی منالآن و یاریەكان زیاتر دەبێت لە هەموو حاڵەتێكدا زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان دەبێتە مایەی زیادە بوونی خواستەكان بۆ خانووبەرە و خۆراك و پۆشاك. كەواتە (پەیوەندییەكە ڕاستەوانەیە).

### ٢- داهاتی بەكاربەر: Consumers income

بە بەرز بوونەوەی داهاتی تاكەكەس ، خواستیان زیاد دەبێت لەسەر شمەك، بەڵام لێرەدا پێویستە جیاوازی لە نێوان دوو جۆرە شمەك بكەین.

أ- شمەکی جوانکاری.

ب- شمەکی ئاست نزم*.

بەرزبوونـــەوەی داهـــاتی هاولاتیـــان بەگـــشتی ئاســـتی گوزەرانیـــان بەرزدەکاتـەوە. زیـاتر هانیـان دەدات بـۆ کڕینـی شمـەکی جوانکـاری وەك" تەلـەفزیۆن، ڤیـدیۆ، کۆمپیوتـەر" وە نـزم بوونـەوەی داهاتیـان بەگـشتی خواست لەسەر ئەم شمەکانـە کـەمتر دەبێتـەوە و خواسـت لەسـەر شمەکـە ئاست نزمەکان زیاتر دەبێت وەك (ئۆتۆمبێلی کۆن و پۆشاکی بەکارهاتوو)

*(پەیوەنـدی نێـوان خواسـت لەسـەر شمـەکی سـادەیان بلـێین شـەکی ئاسایی لەگەڵ داهاتی نەختینەیی پەیوەندییەکەی راستەوانەیە .

* پەیوەندی نێوان خواست لەسـەر شمـەکی ئاسـت نـزم لەگـەڵ داهـاتی نەختینەیی پەیوەندییەکی پێچەوانەیە .

---

* شمەکی ئاست نزم (السلع الدنیا) : ئەو شمەکانەن کە کڕینیان زیاد دەکات کاتێك داهاتی بەکاربەر کەمدەکات وپێچەوانەکەشی راستە، کڕینیان کەمدەکات کاتێك داهاتی بەکاربەر زیاددەکات ، جێی ئاماژە بۆ کردنە کە شمەکی ئاست نزم بە شمەکی هەژاران دەناسرێت،لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێن مەبەست لە شمەکی ئاست نزم ئەوەنیە کە کەڵکی نەبێت .

### ٣-حەزی بەکاربەر: Consumer taste

یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکان کە کاردەکەنە سەر خواستی بەکاربەر بۆ شمەك چونکە، هەر کاتێك بەکاربەر حەزی خۆی دایە بەکاربردنی شمەکێك خواستی زیاتر دەبێت لەسەر ئەم شمەکە, وە بەپێچەوانەوە, زیادبوونی حەزو پێویستی بەکاربەر پشت دەبەستێت بە:

أ- سروشتی شمەکەکە.

ب- رادەی پێویستی پێ بوون.

ج- باشیەکەی (جودتها).

د- لایەنەکانی تر وەك : پروپاگەندە و رێکلام.

هـ - داب و نەریت: لەهەندێك ولآتاندا دانیشتوانەکانیان بەرادەیەکی زۆر چا بەکاردەهێنن وە لە هەندێك ولآتانی تردا قاوە بەکار دەهێنن.

کەواتە: (پەیوەندییەکە راستەوانەیە).

### ٤-نرخی شمەکەکانی تر: Prices of other goods

زۆر جار خواستی بەکاربەر بۆ شمەکێك دەگۆرێت بەهۆی ئەو گۆرانکاریانەی کە روودەدات لە نرخی ئەو شمەکانەی کەبەو شمەکەوە بەستراونەتەوە، لێرەدا پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان ئەم شمەکانەدا.

#### أ- شمەکە تەواوکەرەکان Complementary goods

ئەو شمەکانەن کە پێویستن بۆ شمەکەکان تر وەك بەنزین تەواوکەری ئۆتۆمۆبێلە، شەکر تەواوکەری چایە، بەرزبوونەوەی نرخی بەنزین دەبێتە مایەی دابەزینی خواست لەسەر ئوتۆموبیل وە بەپێچەوانەوە.

( پەیوەندی نێوان خواست و نرخی شمەکە تەواوکەرەکان پەیوەندییەکی پێچەوانەیە)

ب-شمەکە شوێن گرتووەکان: Substitute goods

ئەو شمەکانەن کە دەتوانن شوێنی شمەکەکانی تر بگرنەوە لە کاتی بەرزبوونەوەی نرخ دا. بۆ نموونە میوە جۆراو جۆرە دەکرێ شوێنی یەك بگرنەوە, بەکاربەر کە سەرنج دەدات یەك کیلۆ سێو نرخەکەی بەرزبۆتەوە دەکرێ مۆز شوێنی بگرێتەوە وە یان پرتەقاڵ...هتد گۆشتی مریشك لە شوێنی گۆشتی ئاژەڵ و ماسی.

(پەیوەندی نێوان خواست و نرخی شمەکە شوێن گرتووەکان پەیوەندی ڕاستەوانەیە )

٥- پێشبینیەکانی بەکاربەر: Consumer's Expectation

پێشبینیەکانی بەکاربەر کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر زیاد بوون و کەمبوونەوەی خواست بۆ شمەکێك چونکە. کاتێك بەکاربەر پێشبینی بەرزبوونەوەی نرخی شمەکێك دەکات لەبازاڕدا ئەوا خواستی زیاد دەبێت بۆ ئەو شمەکە وە بە پێچەوانەوە, هەر بۆ نمونە بەکاربەری نەوت پێشبینی بەرزبوونەوەی نرخەکەی دەکات لە وەرزی زستاندا, بۆیە لە وەرزی هاویندا دەیکڕێ و ئەمباری دەکات بۆ ئەو کاتە بەکاری دەهێنێ لە ترسی بەرزبوونەوەی نرخەکەی لە زستاندا ..

(پەیوەندی نێوان پێشبینیەکان و خواست ڕاستەوانەیە)

# خستنه ڕوو
# SUPPLY

لایەنی دووەمە لە بازاڕ, وە ئەم ڕۆڵە بەرهەم هێن پێی هەڵدەستێ بۆ بەرهەمهێنان و فرۆشتنی شمەك و خزمـەت گوزاریـە جۆربـەجۆرەکان, بۆیـە خستنە ڕوو ئەم بنەمایانەی خوارەوە بە خۆوە دەگرێت:—

١. ئەو بڕەیە بەرهەمهێنەکان بۆ فرۆشتن دەیخەنە ڕوو
٢. لە بازاڕێکی دیاری کراو.
٣. لە شمەکێك یان خزمەت گوزاریەکی دیاری کراو.
٤. بە نرخێکی دیاری کراو.
٥. لە ماوەیەکی دیاری کراو.

لەمەوە بەدیارکەوت کە خستنە ڕوو بۆ ئەوەی بـە کـردار خـستنە ڕوو بێت, پێویستە شمەکێك هەبێت و لە بازاڕدا خرابێتە ڕوو , مەبەسـتیش لـەم خـستنەڕووە فرۆشـتن بێـت وە نرخێکـی دیـاری کـراوی هــەبێت ، و بــە ماوەیەکی دیاری کراوەوە بەسترابێتەوە .

**خستنەڕوو :**

ئـارەزوو توانـستی فرۆشـیار یـان بەرهـەم هێنـە لـە دابـین کردنـی بـڕە جیاجیاکانی شمەکێك بە نرخێکی گونجاوەلە ماوەیەکی دیاریکراودا.

## خشتەی خستنە ڕوو : Supply schedule

بەرامبەر هەر نرخێك كە بەرهەم هێن لەوانەیە بیخاتە ڕوو دەبینین بەرهەم هێن بڕێكی دیاری كراوی لێ دەخاتە ڕوو بۆ فرۆشتن لەماوەیەكی دیاری كراودا ئەوەش پێ ی دەڵێن خشتەی خستنەڕوو.

**خشتەی خستنە ڕوو:**

ڕەنگدانەوەی ئەو بڕە جۆربەجۆرانەن لە شمەكێك كە بەرهەم هێن دەیەوێت ودەتوانێت بەرهەمی بهێنێت وبیفرۆشێت لە ئاستی نرخە جیاوازیەكاندا لە بازاڕێكی دیاری كراودا وە لە ماوەیەكی دیاری كراودا.

ئەم خشتەیەی خوارەوە خستنە ڕووی بەرهەم هێنەرێكە لە شمەكێكی دیاری كراو و لەماوەیەكی دیاری كراودا .

| بڕی خستنەڕوو ( ب.خ )<br>Quantity Supplied(QS) | نرخ ( ن )<br>Price (P) |
|---|---|
| ٥٠ | ١٠ |
| ٤٠ | ٨ |
| ٣٠ | ٦ |
| ٢٠ | ٤ |
| ١٠ | ٢ |

له خشته‌كه دا تێبینی ده‌كرێت ,دابه‌زینی نرخ له (١٠) دۆلار بۆ (٨) دۆلار ده‌بێته مایه‌ی دابه‌زینی بڕی خستنه‌ڕووه‌كه له (٥٠) یه‌كه بۆ (٤٠) یه‌كه, وه هه‌ڵكشانی نرخ له (٦) دۆلار بۆ (٨) دۆلار ده‌بێته مایه‌ی زیاد بوونی بڕی خستنه‌ڕووه‌كه له (٣٠) یه‌كه بۆ (٤٠) یه‌كه واتاكه‌ی:

**په‌یوندی نێوان گۆڕان له نرخ و گۆڕان له‌بڕی خستنه‌ڕووی شمه‌كه‌كه ڕاسته‌وانه‌یه**




**چه‌ماوه‌ی خستنه ڕوو**

## چەماوەی خستنەڕوو: Supply Curve

خشتەی خستنەڕووی داتاکانە, ئەگەر خشتەی خستنەڕووی پێشوو وەربگیرێت ئەوا چەماوەی خستنەڕوو نیشان دەدات.لە چەماوەی خستنە ڕوودا تێبینی ئەمانە دەکرێت:—

١. ئاراستەکەی لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە وە لە چەپەوە بۆ لای ڕاستە .
٢. ئاراستەکەی بەمانای برە خستنەڕووەکە زیاد دەبێت بە بەرزبوونەوەی ئەم نرخە وە و کەم دەبێت بە دابەزینی نرخەکە.
٣. پەیوەندی نێوان بڕی خستنەڕوو ونرخ ڕاستەوانەیە (پۆزەتیف +).

## یاسای خستنە ڕوو: Law of Supply

پێشبینی دەکرێت هەر چەند نرخی شمەك بەرز ببێتەوە ، بڕی خستنەڕووی ئەوشمەکە زیاد دەبێت کە بەرهەم هێنەکان ئارەزووی خستنەڕوویان هەیە، وە یان بە پێچەوانەی دابەزینی نرخ وا دەکات کە بەرهەم هێنەکان بڕی خستنە ڕووی شمەکەکانیان کەمتر بکەنەوە ، چونکە خستنەڕوو بەستراوەتەوە بە تێچوونی بەرهەم هێنان , بۆ نموونە بەرهەم هێن بڕێکی زۆر لە شمەکێك ناخاتە ڕوو ئەگەر نرخەکەی ئەو تێچوونەی بۆ پڕنەکاتەوە.

لە لایەکی ترەوە نرخی شمەك تاکە هۆکار نیە کاریکاتە سەر بڕی خراوە ڕوو بۆ فرۆشتن لە بازاڕدا بەڵکو چەندەها هۆکاری تر هەیە کەوا دواتر باسیان دەکەین .

**یاسای خستنەڕوو**

به گریمان شتەکانی تر وەك خۆیان بمێنینەوە , ئەوا پەیوەندی نێوان نرخ و برە خستنەڕووەکە پەیوەندیەکی ڕاستەوانەیە.

## ئەو هۆكارانەی كەخستنەڕوو دیاری دەكەن

## Determinantes of Supply

### ١. ژمارەی بەهەم هێن ( فرۆشیار ):

### Number of sellers or producers

شتێكی سروشتی یە هەرچەند ژمارەی بەرهەم هێن زیاد بێت ئەوا بڕی خستنەڕوو لە بازاڕدا زیاد دەبێت , هاوكات كەم بوونی ژمارەی بەرهەم هێن یان فرۆشیار دەبێتە مایەی كەمی بڕی خستنەڕوو.

> پەیوەندی نێوان ژمارەی بەرهەم هێن و بڕی خستنەڕوو راستەوانەیە.

### ٢. بەكارهێنانی تەكنۆلۆژیا:

### Using Technology

لێرەدا پەیوەندی هەیە لە نێوان ئاستی تەكنیكی بەرهەمهێنان و خستنەڕووی شمەكدا.چونكە هەمیشە بەرهەم هێن كاردەكات لە پێناو پێشخستنی بەرهەمەكەی و باشتركردنی ئاستی تەكنیكی لە كرداری بەرهەم هێنان دا بەمەبەستی كەمبوونەوەی تێچوون, وە دواتر زیادكردنی بڕی بەرهەم هێنراو, ئەمەش لەلایەن خۆیەوە دەبێتە مایەی زیادكردنی خستنەڕووی شمەك. باشتركردنی ئاستی تەكنیكی لە كرداری بەهەم هینانداا لە رێگای بەكارهێنانی ئامێری نوێ یان شێوازەكان و ئامرازە تەكنیكیە نوێیەكان دابێت .

> پەیوەندی نێوان ئاستی تەكنیكی لە كرداری بەرهەم هێنان دا و بڕی خستنەڕوو پەیوەندیەكی راستەوانەیە .

### ٣. نرخی بنەماكانی بەرهەم هێنان: Inputs prices

لەكاتی بەرزبوونەوە (یان نزم بوونـەوە)ی نرخـی بنـەماكانی بەرهـەم هێنـانی هەرشمـەكێك, دەبێتـە مایـەی نـزم بوونـەوە(یـان بەرزبوونـەوە)ی تێچوونی بەرهەم دواتر زیـادبوونی (یـان كـەمبوونی) بـڕی خـستنە ڕوو لـەم شمەكە.

پەیوەندی نێوان نرخی بنەماكانی بەرهەم هێنان وبڕی خستنەڕوو پەیوەندیەكی پێچەوانەیە

### ٤. باج و كۆمەك: Taxes and Subsidies

زیـاد بـوونی بـاج و ڕەسمـی سـەپێندراو لەسـەر بەرهـەم هێنـەكان, دەبێتە مایەی زیاد بوونی تێچوونی بەرهەم هێنـان ئـەوەش خـستنەڕووەكە كەم دەكاتەوە هەرچەندە دەوڵەت زۆر جار بەمەبەستی هاندانی وەبەرهێنان لەوەرگرتنی باج خۆش دەبێت لەهەندێ لەپرۆژەڵە ئابوورییەكان ئـەوەش لـە ئاكامدا دەبێتە هۆی زیادبوونی بڕی خستنەڕوو چونكە قازانجی ئەم پرۆژانە زیاتر دەبێت.

هـەروەها دەوڵـەت پـەنا دەباتـە بـەر كۆمـەك كردنـی هەنـدێك لـە پیشەسازییەكان بەمەسـتی هانـدانیان بـۆ زیـاتر كردنـی بەرهەمـەكانیان وە دواتـر زیـادبوونی بڕیخـستنەڕوو, چـونكە كۆمـەك كـردن ئەنجامەكـەی كەمكردنەوەی تێچوونە.

پەیوەندی نێوان باج و بڕی خستنەڕوو پەیوەندییەكی پێچەوانەیە

پەیوەندی نێوان كۆمەك و بڕی خستنەڕوو پەیوەندییەكی ڕاستەوانەیە

## هاوسەنگی کارلێکردن ( خواست و خستنەڕوو )

## Equilibrium: The Interaction between Supply and Demand

هەر بازاڕێك بە بازاڕێکی تەواو دانانرێت, بەکرداریش نابێتە بازاڕ بۆ ساغ کردنەوەی هەرشمەکێك، مەگەر بەکارلێکردنی خواست نەبێت کە خۆی دەنوێنێت لە ئارەزوو توانستی بەکاربەر بۆ کڕینی شمەکێك بە نرخێکی دیاری کراو, وە بەکارلێکردنی خستنە ڕووی نەبێت کە خۆی دەنوێنێت لە توانست وئارەزووی بەرهەم هێن بۆ خستنە ڕووی ئەم شمەکە لە بازاڕدا بە مەبەستی فرۆشتنی بە نرخێکی دیاری کراو, ئەمەش مانای وایە کە فاکتەری سەرەکی بۆ بازاڕ بریتیە لەکارلێك کردن وئاوێتەبوونی هێزەکانی خستنەڕوو لەگەڵ هێزەکانی خواست، ئەمەش نرخێکی دیاریکراو لێ دەکەوێتەوە بۆ ئەو شمەکەی کەلەبازاڕدا دەفرۆشرێت. بۆ ڕوون کردنەوەی بیرۆکەی کارلێك کردنی هێزەکانی خستنەڕوو لەگەڵ هێزەکانی خواست لە بازاڕی شمەکێکی دیاری کراودا. گریمان ئەم خشتەیەی خوارەوە تیایدا برەکانی خواست و برەکانیخستنەڕوو لەچەند ئاستێکی جیاوازی نرخدا پیشان دەدات .

| نرخ ( ن ) | بڕی خستنەروو ( ب. خس ) | بڕی خواست ( ب. خو ) | بازاڕ |
|---|---|---|---|
| ١٠ | ١٠٠٠ | ٢٠٠ | ٨٠٠ (زێدەیی) |
| ٨ | ٨٠٠ | ٤٠٠ | ٤٠٠ (زێدەیی) |
| ٦ | ٦٠٠ | ٦٠٠ | ٠ (هاوسەنگ) |
| ٤ | ٤٠٠ | ٨٠٠ | – ٤٠٠ (کورتی) |
| ٢ | ٢٠٠ | ١٠٠٠ | – ٨٠٠ (کورتی) |

لـه خـشتەكەدا تێبـینی دەكرێـت لـە نرخـی (١٠$) دۆلار خـستنە ڕووی شمەكەكە زۆر زیاترە لە بڕی خواست, واتە خستنە ڕووەكـە بـە بـڕی (٨٠٠) یەكە زێدەیە, ئەمەش مانای ئەوەیە بەرهەم هێن ناتوانێت بڕی خـستنە ڕوو بەم نرخـە بفرۆشـێت, چـونكە بـەكار بـەر ئـەم نرخـە بەبـەرز دادەنێـت, وە بەرهەم هێن بەم رەوشە قایل نیە, چونكە ئەم زێدەیە بەتێپـەڕبوونی كـات كەڵەكە دەبێت, بۆیە ئەگەر بەرهەم هێن ویستی بڕێكی زۆرتر لـە شمەكەكـە بفرۆشێت" پێویستە نرخەكەی دابەزێنێت دەبێتە مایـەی زیـاد بـوونی بـڕی خواسـت لـەم شمەكـە, تادەگاتـە حاڵـەتی هاوسـەنگی . هـەروەها تێبینـی دەكرێت لە نرخی (٦) $ كە بڕی خواست لە شمەكێكدا یەكسانە بە بڕەكەی لەخـستنەڕوودا, ئەمـەش مانـای وایـە بـازاڕی ئـەم شمەكـە لـە حاڵـەتی هاوسـەنگیە, وە نرخـی (٦) $ نرخـی هاوسـەنگیە, وە بـڕی (٦٠٠) بـڕی هاوسەنگیە.

گریمان ئەو شمەكەی خراوە تـە ڕوو لـە بـازاڕدا نرخەكـەی(٢) دۆلارە دەبیـنین بـڕی خواسـت زۆرە (١٠٠٠) یەكەیـە وەك لـە خـشتەكەدا ڕوون كراوەتەوە . بەڵام بڕی خستنەڕووی كەمە (٢٠٠) یەكەیە ئەمەش مانای وایە تووشی كـەمی خـستنە ڕوو (یـان كـورتی هێنـانی خـستنەڕوو) زێدەكی لـە خواستدا هاتووە وە بۆ ئەوەی بەرهەم هێن پشتگیری بازاڕ بكات بە یەكـەی زێدەكی لە شمەكەكە بۆ دابین كردنی پێویستی خواست پێویستە نرخ بـەرز بكاتەوە هاوكات سەر لە نوێ دەگاتە حاڵەتی هاوسەنگی.

دەکرێ حاڵـەتی هاوسـەنگی بـە وێنـە ڕوون بکرێتـەوە بـەم شـێوەی خوارەوە :




حاڵەتی هاوسەنگی لە بازاڕی شمەکە جیاوازەکاندا لە ژێر گـۆڕان دان وە نـرخیش بـەردەوام جـێگیر نیـە, هۆکارەکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو گۆڕانکاریانەی لە میکانیزمی بازاڕ ڕوودەدەن، بە تایبەتی گۆڕانکاریەکان لە بـارودۆخی خـستنە ڕوو و خواسـتدا , ناهاوسـەنگی وگۆڕانکاریـەکان کـە لـە بـازاڕی شمەکێکـدا ڕوودەدەن لەئـەنجامی گۆڕانکاریـەکانی خواسـت و خستنەڕوو دا وەیان هەردووکیان بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

لە ئەنجامدا خستنەڕوو کەم دەکات لەم حاڵەتەدا نرخ بەرز دەبێتەوە:

کاتێك: بڕی خواست ب.خو> بڕی خستنەڕوو ب.خس ← نرخ بەرز دەبێتەوە

١.چەند هێزەکانی خواست گەورەتر بێت لەهێزەکانی خستنەڕوو لە ئەنجامدا ئەوەندە کەمی (کورتی)خستنەڕووی لێدەکەوێتەوە ،لەم حاڵەتەدا نرخ بەرزدەبێتەوە

٢.چەند هێزەکانی خستنەڕوو گەورە تر بێت لە هێزەکانی خواست لە ئەنجامـدا ئەوەنـدە زێـدەیی لــە خــستنەڕوودا دێتەکایــەوەو ،نــرخ بــەرەو کەمبوونەوە لار دەبێتەوە .

> کاتێك: بڕی خستنەڕوو ب.خس > بڕی خواست ب.خو ← نرخی نزم دەبێتەوە

٣. بەڵام ئەگەر هـاتوو لێـرەدا هێزەکـانی خواسـت و خـستنە ڕوو بـۆ بازاڕی شمەکێك لە حاڵەتی یەکسانی دابـوون ئـەوا نـرخ جـێگیر و چەسـپاو دەبێت هاوسەنگی دێتە ئاراوە کاتێك:

> کاتێك: بڕی خواست ب.خو = بڕی خستنەڕوو ب.خس ← هاوسەنگی

## بەشی چوارەم

## نەرمی نواندن

## ELASTICITY

نەرمی نواندن: بە شێوەیەکی گشتی بە مانای ڕادەی وەڵام دانەوە بۆ گۆڕان لە شتێکدا –نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری، بە مانای ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواستە لە شمەکێکدا لەئەنجامی گۆڕان لە نرخەکەیدا، (نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری بە مانای ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواستە لە شمەکێکدا لە ئەنجامی گۆڕان لە داهاتدا).

## بەشی یەکەم

## نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری

## PRICE ELASTICITY OF DEMAND

وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە کەوا دەقی یاسای خواست ئاماژە بە بوونی پەیوەندیەکی پێچەوانەیی دەکات لە نێوان گۆڕان لە نرخی شمەکێکدا وە گۆڕان لە بڕی خواستەکەیدا.بەڵام ئەم یاسایە ئاماژە بە ڕادەی یان ڕێژەی گۆڕانەکە ناکات وە یاخود بە ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواستەکە ناکات لە ئاکامی گۆڕان لە نرخی شمەکەکە، واتا یاسای خواست ڕادەی یان ڕێژەی ئەم زێدەییە ڕوون ناکاتەوە بۆیە پێویستە ئامرازێك هەبێت بۆ پێوانی ڕێژەی گۆڕان بۆ بڕی خواست لە شمەکەکاندا لە ئەنجامی گۆڕان لە نرخەکانیاندا بەڕێژەیەکی دیاری کراو لێرەدا چەمکی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری هاتۆتە کایەوە.

بۆ ڕوون کردنەوەی چەمکی ئەم نەرمی نواندنەو شێوەکانی ئەم نمونەی خوارەوە دەهێنینەوە بۆ ئاسان کردنی بیرۆکەی نەرمی نواندنی خواست.

گریمان دانیشتوانی شاری هەولێر مامەڵە بە پێنج جۆرە شمەکەوە دەکەن بە بڕ و نرخێکی دیاری کراودا . وا دادەنێین نرخەکانی هاوسەنگ بوون لەم بازاڕەدا کەم بوونەوە . ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە بڕی خواست دا ڕوو دەدەن چەندە؟

| شەکر | | گوڵی جوانکاری | | سێو | | خوێ | | کراسی زستانە | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ن | ب.خو | ن | ب.خو | ن | ب.خو | ن | ب.خو | ن | ب.خو |
| ١٠ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠٠ |
| ٦ | ١١٠ | ٦ | ١٨٠ | ٦ | ١٤٠ | ٦ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠ |

لە نمونە ی سەرەوەدا تێبینی دەکەین کە ئەو گۆڕانکاریانەی لە پێنج شمەکەکاندا ڕووی داوە جیاجیان هەر چەندە ئێمە بە ئەنقەست نرخەکەمان بە هەمان ڕێژە گۆڕیوە.

کەمبوونەوە ی نرخی شەکر لە (١٠) دینار بۆ (٦) دینار بوە مایەی گۆڕانی بڕی خواست لە (١٠٠) یەکە بۆ (١١٠) یەکە ئەمەش مانای وایە ڕێژەی گۆڕان لە بڕی خواست کەمترە لە ڕێژەی گۆڕان لە نرخدا ئەوەش بەڵگەیە کە گۆڕانکاریەکانی بڕەکە نەرمی نانوێنێت بەرامبەر بە گۆڕانکاری لە نرخ, ئەوەش بەڵگەیە کە شەکر شمەکێکی پێوستە.

بەڵام دابەزینی نرخی گوڵی جوانکاری لە (١٠) دینار بۆ(٦) دینار بڕی خواست زیادی کرد لە (١٠٠) یەکە بۆ (١٨٠) یەکە ئەوەش بەڵگەیە کە بڕەکان بە ڕێژەیەکی گەورە گۆڕان واتا خواست لەسەر گوڵی جوانکاری

نەرمی نواندنەکەی زۆرترە چونکە شمەکێکی جوانکاریەو بڕی خواست تەنها بە دابەزینی نرخەکەی زیاد دەبێت.

سەبارەت بە نرخی سێو تێبینی دەکەین بڕی خواست گۆڕاوە بە هەمان ڕێژەی گۆڕانی لە نرخدا چونکە شمەکەکە شوێن گرەوەی هەیە لە بازاڕدا.

بەڵام شمەکی (خوێ) هەرچەندە نرخەکەی دابەزیوە لە (١٠) دینار بۆ (٦) دینار کەچی بڕی خواستی نەگۆڕە واتا خواستەکە بۆخوێ بێ نەرمی نواندنە، چونکە لەلایەکەوەنرخەکەی بەشێکی گەورە لە داهاتی بەکاربەر پێك ناهێنێت لەلایەکی تریشەوە بنەڕەتییە.

وە سەبارەت بە کراسە زستانییەکان بەم گریمانەی کە نرخەکەی نەگۆڕە . بەڵام بڕی خواستی گۆڕاوە لە (١٠٠) یەکە لە وەرزی هاوین بۆ (١٠) یەکە لە وەرزی زستان بە مانای خواستی نەرمی نواندنەکەی بێ کۆتاییە .

لەم نمونە ی سەرەوەدا دەگەینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە:

نەرمی نواندن پەیوەندی بەڕادەی یان ڕێژەی گۆڕان هەیە لە بڕدا، کەواتا نەرمی نواندن پێوانەیە بۆ ڕاددەی وەڵام دانەوەی بڕی خواست لە شمەکێکی دیاری کراو بۆ گۆڕان ئەویش ئەگەر هۆکارە کاریگەرەکە گۆڕا شایانی باسە ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر خواست وەك زانیومانە ئەمانەن:-

نرخی شمەکەکە خۆی، نرخی شمەکەکانی تر، داهاتی نەختینەی بەکاربەر، حەزی بەکاربەر لەمەوە پێناسەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

**نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری:**

ڕادەی یان ڕێژەی گۆڕانە کە لە بڕی خواستی شمەکێکدا ڕوودەدات لە ئـەنجامی گـۆڕان لـە نرخەکەیـدا لەگـەڵ مانـەوەی هۆکارەکـانی تـر بـە

چۆن ئەم نەرمی نواندنە دەپێودرێت؟

هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری دەپێورێت بە پێ ی ئەم یاسایە ی خوارەوە:

گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواست

هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری = ــــــــــــــــــــــــــــ

گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا

یان

| هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواست= | Δ ب. خوا / Δ ن | = | ب٢−ب١ / ب١ | ÷ | ن٢−ن١ / ن١ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |

بڕە خواستەکانی یەکەمە: ب١

بڕە خواستەکانی دووەمە: ب٢

نرخی یەکەمە: ن١

: نرخی دووەمە : ن٢

ڕادەی نەرمی نواندنی خواست: نە. خواست

گۆڕان لە بڕی خواست: Δ ب. خواست

گۆڕان لە نرخ: Δ ن

**تێبینی:** هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیر نیگەتیڤە (-) چونکە ڕەنگدانەوەی ئەم پەیوەندیە بنەڕەتییە لە نێوان بڕی خواستی شمەکێك لەگەڵ نرخەکەیدا ئەوەش پەیوەندیەکی پێچەوانەییە.

## شێوەکانی ( جۆرەکانی ) نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری

شمەك و خزمەت گوزاریەکان جیاوازیان هەیە لە ڕووی گرنگی و پێویستیان سەبارەت بە بەکاربەرەوە، بۆیە ئەو گۆڕانکایانەی کە لە نرخی شمەکەکان ڕوودەدات دەبێتە مایەی گۆڕانی بڕی خواستەکانیان بە ڕێژەی جیاجیا ئەوەش ڕوون دەبێتەوە لەمیانەی شێوەکانی نەرمی نواندنی نرخگیریدا وەك لە خوارەوەدا هاتووە:-



شێوەکانی نەرمی نواندنی خواست

أ- چەماوەی خواستی نەرمی نواندنی (بێ کۆتایی)
ب-چەماوەی خواستی (نەرمی نواندن)
ج- چەماوەی خواستی (هاوتایی)
د- چەماوەی خواستی (نەرمی نواندنی کەم)
هـ- چەماوەی خواستی (بێ نەرمی نواندن)
(نەرمی لەباردا نەبوو)

### ١- خواستی بێ نەرم نواندن(نەرمی لەباردانەبوو) Perfectly Inelastic Demand

واتا هەر گۆڕانێك لە نرخ نابێتە مایەی گۆڕان لە بڕی خواست.

## خەسڵەتەکانی:

- پلەی یان هاوکۆلکەی نەرمی نواندن =صفر (هیچ).
- نرخ دەگۆڕێت وە بڕی خواست نەگۆڕە.
- چەماوەی خواست شێوەی هێڵێکی ڕاستی تەریب بە تەوەری نرخدا وەردەگرێت.

ئەو جۆرە شمەکانەش دەگرێتەوە کە بڕی خواستیان ناگۆڕێت هەرچەندە نرخیان بگۆڕێت وەك ((خوێ چێشت, دەرمان)).

## نمونه :-

| نرخ ن | بری خواست ب. خوا p |
|---|---|
| ١٠ | ١٢ |
| ٨ | ١٢ |

وە

ب٢ = ١٢ ، ب١ = ١٢ ، ن٢ = ٨ ، ن١ = ١٠

## شیکار:-

$$= \frac{\text{بری دووەم-بری یەکەم}}{\text{بری یەکەم}} \div \frac{\text{نرخی دووەم} - \text{نرخی یەکەم}}{\text{نرخی یەکەم}}$$

$$\text{ه خ} = \frac{\text{ب٢-ب١}}{\text{ب١}} \div \frac{\text{ن٢-ن١}}{\text{ن١}}$$

$$\text{ن.خو} = \frac{١٢ - ١٢}{١٢} \div \frac{٨ - ١٠}{١٠} = \frac{٠}{١٢} \div \frac{-٢}{١٠} = \frac{٠}{١٢} \times \frac{١٠}{-٢} = \text{سفر}$$

چەماوەی خواستی بێ نەرمی نواندن (نەرمی لەباردانەبوو)




## ٢- خواستی کەم نەرمی نواندن ((نەرمی نواندنی کەم))Inelastic Demand

واتا گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواست دا کەمترە لە گۆڕانی ڕێـژەیی لـە نرخ دا.

### خەسڵەتەکانی:

- گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواست دا کەمترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا .
  ن٪ Δ > ب. خو Δ٪
- هاوکۆلکەی یان پلەی نەرمی نواندنی خواست کەمترە لە (یەك ژمارەی تەواو).
- چەماوەی خواست زۆر لار دەبێتەوە نزیکترە لە هێلێکی ڕاست کـە تـەریب دەبـێ بۆ تەوەری ستوونی.

وە نمونە بۆ ئەم جۆرە شمەکە پێویستانە ((نان, خزمەت گوزاری پزیشکایەتی))

**نمونە :**

| ن | ب. خو |
|---|---|
| ١٠ | ١٤ |
| ٨ | ١٥ |

ب٢ = ١٥ ، ب١ = ١٤ ، ن٢ = ٨ ، ن١ = ١٠

**شیكار:-**

$$ه خ = \frac{ب٢ - ب١}{ب١} \div \frac{ن٢ - ن١}{ن١}$$

$$نه.خو = \frac{١٥ - ١٤}{١٤} \div \frac{-٢}{١٠} = \frac{١}{١٤} \times \frac{١٠}{٢} = ٠,٣٥٧$$

وێنەی بە داتایی نواندن

چەماوەی خواستی كەم نەرمی نواندن




٣. خواستی هاوتایی ((نەرمی نواندنی ژمارە یەك)):

Unitary Elasticity Demand

گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواستدا = گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا

## خەسڵەتەکانی:

- هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری یەکسانە بە یەک ژمارەی تەواو.
- چەماوەی خواست لە شێوەی هێڵی ناوەراستە لە نێوان هەردوو تەوەری ستوونی و ئاسۆییدا.

نموونەیی ئەم جۆرە شمەکانەش ئەوانەن کەشوێن گرەوەیان هەیە لە بازاڕدا( خانوو, ڕادیۆ).

**نمونە :-**

| ن | ب. خو |
| --- | --- |
| ٨ | ١٦ |
| ٦ | ٢٠ |

ب٢ = ٢٠ ، ب١ = ١٦ ، ن٢ = ٦ ، ن١ = ٨

**شیکار:-**

$$\text{هـ خ} = \frac{\text{ب٢} - \text{ب١}}{\text{ب١}} \div \frac{\text{ن٢} - \text{ن١}}{\text{ن١}}$$

$$\text{نه.خو} = \frac{٢٠ - ١٦}{١٦} \div \frac{٦ - ٨}{٨} = \frac{٤}{١٦} \div \frac{٢-}{٨} = \frac{٤}{١٦} \times \frac{٨}{٢-} = ١$$

## چەماوەی خواستی هاوتایی




### ٤. خواستی نەرم نواندن: Elastic Demand

گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواستدا گەورەترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

**خەسڵەتەکانی:**

- هاوکۆلکەی نەرمی نواندن گەورەترە لە یەك ژمارەی تەواو.
- چەماوەی خواست کەمێك لار دەبێتەوە، وە نزیکترە بۆ تەوەری ئاسۆیی.

نموونەش بۆ ئەمانە شمەکە جوانکارییەکان دەگرێتەوە ((ژەمەکانی خواردن لە چێشتخانە, ئۆتۆمۆبیلەکان)).

**نمونه :-**

| ن | ب. خو |
|---|---|
| ٨ | ١٥ |
| ٦ | ٢٥ |

ن١= ٨ ، ن٢= ٦ ، ب١ = ١٥ ، ب٢ = ٢٥

**شیكار:-**

$$\text{هـ خ} = \frac{\text{ب}^{٢}-\text{ب}^{١}}{\text{ب}^{١}} \div \frac{\text{ن}٢-\text{ن}١}{\text{ن}١}$$

$$= \frac{٢٥-١٥}{١٥} \div \frac{٦-٨}{٨} = \frac{١٠}{١٥} \div \frac{-٢}{٨} = ٢ر٦٦$$

واتا هەر گۆڕانێك لە نرخ بە ڕێژەی ١٪ گۆڕان لە برِە خواستەكانی بـە ڕێژەی ٢,٦٦٪ ی بە دوادا دێت

وێنەی بە داتا نواندنی

چەماوەی خواستی نەرمی نواندن




٥. خواستی نەرمی نواندنی بێ کۆتایی: Demand Elastic Perfectly

بەچاوپۆشین لە هێما نەرمی نواندنی خواست یەکسانە بۆ بێ کۆتایی.

خەسڵەتەکانی:

- بڕی خواست گۆڕاوە وە نرخ ((نەگۆڕە))
- چەماوەی خواست هێڵێکی ڕاستە و تەریبە بۆ تەوەری بڕی خواستەکان.
- هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری یەکسانە بۆ بێ کۆتایی ، نموونەش بۆ ئەمانە شمەکە وەرزیەکان دەگرێتەوە بۆ نموونە برەکانی خواست کەم دەبێتەوە لە پۆشاکی هاوینی لە وەرزی زستاندا بە چاوپۆشین لە نرخەکان .

**نمونە :-**

| ن | ب. خو |
|---|---|
| ٥ | ٧ |
| ٥ | ٨ |

ب٢ = ٨ ، ب١ = ٧ ، ن١ = ٥ ، ن٢ = ٥

$$\frac{\text{ب٢ – ب١}}{\text{ب١}} \div \frac{\text{ن٢ – ن١}}{\text{ن١}}$$

**شیکار:-**

$$= \frac{٨-٧}{٧} \div \frac{٥-٥}{٥} = \frac{٠}{٥} = \frac{١}{٧} \times \frac{٥}{٠} = \infty \text{ بێ کۆتایی}$$

## چەماوەی خواستی نەرمی نواندنی بێکۆتایی



**شێوەکانی نەرمی نواندنی خواستی نرخگیری پوخت کراوەتەوە بە پێ ئەم خشتەیەی خوارەوە:**

| بارەکانی خواست | گۆڕانی ڕێژەیی | جۆری نەرم نواندن |
|---|---|---|
| |نە.خو| > ١ | ن Δ٪ > ب. خوΔ٪ | خواستی نەرم نواندن *Elastic* |
| | نە.خو | < ١ | ن Δ٪ < ب. خوΔ٪ | خواستی کەم نەرمی نواندن *Inelastic* |
| | نە.خو | = ١ | ن Δ٪ = ب. خوΔ٪ | خواستی نەرمی نواندنی ژمارە یەك *Unitary Elastic* |
| سفر = ن خ | برە خواستەکان وەلامی گۆڕانەکان لە نرخدا نادەنەوە | خواستی بێنەرمی نواندن. *Inelastic Demand* |
| بێ کۆتایی بوون نە.خو =∞ | برە خواستەکان بەڕادەیەکی گەورە وەلامی گۆڕانەکان لە نرخدا دەدەنەوە | خواستی نەرمی نواندنی بێ کۆتایی بوون *Perfectly Elastic* |

***تێبینی**:- پێویستە بەهای ڕەهای (|نە.خو|)وەربگیرێت ،واتە نیشانە سالبەکە فەرامۆش دەکرێت چونکە پەیوەندیەکە پێچەوانەیە .

## نەرمی نواندنی خواستی یەکتر بڕی
## Cross Elasticity of Demand

ئەم جۆرە نەرمی نواندنە تایبەتە بە ڕادەی کاریگەری بڕی خواست لە شمەکێکدا بەو گۆڕانکاریانەی کە لە نرخی شمەکە پێوەبەستراوەکانی ڕوودەدات واتا:

| **نەرمی نواندنی خواستی یەکتربڕی:** |
|---|
| ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواستە لە شمەکێکدا بۆ ئەو گۆڕانەی لە نرخی شمەکە پێوەبەستراوەکانی ڕوودەدات. لەگەڵ مانەوەی هۆکارەکانی تر بە نە گۆڕاوی. |

ئەم نەرمی نواندنە بە پێ ی ئەو یاسایەی خوارەوە پێوانە دەکرێت:

$$\text{نەرمی نواندنی خواستی یەکتربڕی} = \frac{\text{گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواست لە شمەکێکدا}}{\text{گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخی شمەکە پێوە بەستراوەکان}}$$

وە ئەم ڕێسا گشتیەی کەوا لە میانەی دا دەکرێ سروشتی پەیوەندی نێوان شمەکە پێوە بەستراوەکان لێك جیابکاتەوە, ئایا تەواو کەرن یان شوێن گرتووەکانن بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

| ئەگەر هێمای نەرم نواندنی خواستی یەکتربڕی نێگەتیف (−) بوو، ئەوا مانای ئەم دوو شمەکە تەواوکەری یەکترن. |
|---|

وە

| ئەگەر هێمای نەرم نواندنی خواستی یەکتربڕی پۆزەتیف (+) بوو، ئەوا مانای ئەم دوو شمەکە شوێن گرەوەی یەکترن. |
|---|

بەمەبەستی ڕوون کردنەوە ئەم دوو نمونەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:

**نمونە :-**

گریمان نرخی یەك كیلۆگرام چا بە ڕێژەی ٢٠٪ بەرز بۆوە لە ئەنجامدا بووە هۆی كەمبوونەوەی ئەو برە شەكرەی كە بەكاربەران دەیكڕن بەڕێژەی ٣٠٪ . بەم پێیە دەكرێ نەرمی نواندنی یەكتربڕی لە نێوان ئەم دوو شمەكە بەم شێوەیەی خوارەوە حیساب بكەین.

X: شەكر

Y: چایە

$$EXY = \frac{\%\Delta Qx \quad \text{شەكر}}{\%\Delta py \quad \text{چا}} = \frac{\%30-}{\%20+} = -1.5$$

هێمای EXY نێگەتیڤە (−) بۆیە ئەم دوو شمەكە تەواوكەری یەكترن.

**نمونەی (٢):**

گریمان نرخی سێوی هاوردە بەرز بۆوە بەڕێژەی ١٥٪، لە ئەنجامدا بووە هۆی زیاد بڕی سێوی خۆماڵی كە بەكاربەران دەیكڕن بە ڕێژەی ٢٥٪ . بەم پێیە دەكرێ نەرمی نواندنی یەكتربڕی لە نێوان ئەم دووشمەكە بەم شێوەیەی خوارەوە حیساب بكەین.

X: سێوی خۆماڵی

Y: سێوی هاوردە

$$EXY = \frac{\%\Delta QX \quad \text{سێوی خۆجێ یی}}{\%\Delta PY \quad \text{سێوی هاوردە}} = \frac{\%25}{\%15} = (+)1.67$$

لەبەرئـەوەی هێمـای EXY پۆزەتیڤـە (+) بۆیـە هـەردوو شمەکـە شـوێن گرەوەی یەکترن .

* تێبینی: ئەگەر نـەرمی نوانـدنی خواسـتی یـەکتربڕی یەکسان بێت بـە سفر واتا سفر = Exy سفر ئەوا شمەکەکە سەربەخۆیە یا خود هیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نیە.

## نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری:
## Income Elasticity of Demand

ئەم نەرمی نواندنە پەیوەستە بە ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواسـت لـە شمەکەکانـدا لـە ئـەنجامی ئـەو گۆڕانکاریانـەی ڕوودەدات لـە داهـاتی بەکاربەردا لەگەڵ مانەوەی هۆکارەکانی تر بە نـەگۆڕاوی – وە پێناسـەکەی بەم شێوەیە:

**نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری:** ڕادەی وەڵام دانەوەی بڕی خواستە لـە شمەکێکـدا لـە ئـەنجامی گـۆڕانی داهـاتی بەکاربـەر لەگـەڵ مانـەوەی هۆکارەکانی تر بەنەگۆڕی

ئەم نەرمی نواندنە وەك لە خوارەوەدا هاتووە هەژمار دەکرێت بە پێی ئـەو یاسایە

$$\text{هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری} = \frac{\text{گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواست}}{\text{گۆڕانی ڕێژەیی لە داهاتی بەکاربەر}}$$

یان

$$\text{نه.د} = \frac{\text{ب}_{٢} - \text{ب}_{١}}{\text{ب}_{١}} \div \frac{\text{د}_{٢} - \text{د}_{١}}{\text{د}_{١}}$$

نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری: $eI$

گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕە خواستەکان: $\%\Delta Qd$

گۆڕانی ڕێژەیی لە داهات: $\%\Delta I$

هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری نێگەتیف دەبێت یان پۆزەتیف، بۆ ئەوەی شمەکی سادە پێویستەکان و جوانکاریەکان و ئاست نزمەکان لێك جیابکرێنەوە.

ئەگەر هێمای نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری پۆزەتیف بوو(+) ئەوا ئەو شمەکە لە سادەکانە وە ئەگەر هاوکۆلکەی نەرمی نواندنەکە گەورەتر بوو لە یەك ژمارەی تەواو ئەوا شمەکێکی جوانکاریە

**نمونە (١):**

گریمان بەکاربەرێك (٨) یەکە لە شمەکی (X) بەکاردەبات کاتێك داهاتەکەی (١٠٠) دینار بێت, کە داهاتەکەی زیاد دەکات و دەبێتە (١٥٠) دینار بەکاربردنی زیاد دەکات لە شمەکی (X)وە دەبێتە (٢٠) یەکە ئایا هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری چەندە؟

**شیكار :**

د١ =١٠٠ ، د٢ = ١٥٠ ، ب١= ٨ ، ب٢= ٢٠

$$eI = \frac{Q2 - Q1}{Q1} \div \frac{I_2 - I_1}{I_1}$$

$$= \frac{20 - 8}{8} \div \frac{150 - 100}{100}$$

$$= \frac{12}{8} \div \frac{50}{100} = +3$$

لێرەدا هێمای نەرمی نواندنەكە پۆزەتیڤە( + ) واتە شمەكی (X) لە شمەكە سادەكانە, هاوكۆلكەی نەرمی نواندنەكەی گەورەترە لە یەك ژمارەی تەواو كەواتە شمەكی (X) لە شمەكی جوانكاریەكانە .

وە ئەگەر هێمای نەرمی نواندنەكە پۆزەتیڤ بێت (+) وە هاوكۆلكەی نەرمی نواندنەكە كەمتر بێت لە یەك ژمارەی تەواو لەم حاڵەتەدا شمەكەكە لە پێویستەكانە .

**نمونە ( ٢ ) :**

گریمان داهاتی بەكاربەرێك (١٠٠) دینارە وە بڕی خواستی لە شمەكی (X) (٨) یەكەیە كاتێك داهاتەكەی بەرز بۆوە بۆ (١٥٠) دینار ئەوا خواستی دەبێت بە (١٠) یەكە ئایا هاوكۆلكەی خواستی داهاتگیری چەندە ؟

**شیكار:**

ب٢ = ١٠ ، ب١ = ٨ ، ل٢ = ١٥٠ ، د= ١٠٠

$$eI = \frac{Q_2 - Q_1}{Q_1} \div \frac{I_2 - I_1}{I_1}$$

$$= \frac{10 - 8}{8} \div \frac{150 - 100}{100}$$

$$= \frac{2}{8} \div \frac{50}{100} = \frac{١}{٢} = ٠,٥$$

دەركـەوت هێمـای نـەرمی نوانـدنی خواسـتی داهـاتگیری پۆزەتیڤـە، واتـا شمەكی (X) شمەكێكی سادەیە، وە هاوكۆلكەی نـەرمی نواندنەكـە كـەمترە لە یەك ژمارەی تەواو بۆیە X لەشمەكە پێویستەكانە

ئەگەر هێمای نەرمی نواندنی خواستی داهاتگیری نێگەتیڤ بوو(−) مانای وایەزیاد بوونی داهات دەبێتە مایەی كەمبوونەوەی بڕی خواست لەو شمەكە لەم حاڵەتەدا ئەو شمەكەبە ئاست نزم دادەنرێت .

**نموونە (٣):**

لە كاتی زیاد بوونی داهاتی بەكاربەر لە (٢٠٠) دینار بـۆ (٣٠٠) دینـار، بڕی خواستەكە لە (١٠٠) یەكە بۆ (٨٠) یەكە كـەم بـۆوە، ئایـا هاوكۆلكـەی نەرمی نواندنی داهاتگیری چەندە؟

**شیكار:**

ب٢ = ٨٠ ، ب١ = ١٠٠ ، ل٢ = ٣٠٠ ، ل١ = ٢٠٠

$$eI = \frac{Q_2 - Q_1}{Q_1} \div \frac{I_2 - I_1}{I_1}$$

$$el = \frac{80 - 100}{100} \div \frac{300 - 200}{200}$$

$$= \frac{-2}{100} \div \frac{100}{200} = -0.4$$

ئـەوەش مانـای وایـە شمەكەكـە لـە جـۆری شمەكـە ئاسـت نزمەكانـە (هەرزانـەكان)، چـونكە بەكاربـەر بـڕی خواسـتـەكەی كـەمتر كـردەوە بـە زیادەبوونی داهاتەكەی.

# نەرمی نواندنی خستنە روو
# ELASTICITY OF SUPPLY

نـەرمی نوانـدنی خـستنە روو هـیچ جیاوازیـەکی نیـە لـەرووی مانـاوە لەگەڵ نەرمی نواندنی خواست چونکە ئەم چـەمکەش بـریتی یـە لـە رادەی وەلام دانەوەی بری خستنە روو لە ئەنجامی گۆران لەنرخدا.

## چۆن نەرمی نواندنی خستە روو دەپێودرێت؟

هاوکۆلکەی نەرمی نوانـدنی خـستنە روو دەپیودرێـت بـە پـی ی ئـەم یاسایەی خوارەوە:

**هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنە ڕوو = گۆڕانی ڕێژەیی بڕی خستنە ڕوو ÷ گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا**

$$\text{نه.خس} = \frac{\Delta\ \text{ب.خس}}{\Delta\text{ن}} = \frac{\text{ب.خس}_2 - \text{ب.خس}_1}{\text{بخس}_1} \div \frac{\text{ن}_2 - \text{ن}_1}{\text{ن}_1}$$

$$Es = \frac{\%\ \Delta\ QS}{\%\ \Delta\ P} = \frac{QS_2 - QS_1}{QS_1} \div \frac{p_2 - p_1}{p_1}$$

دەتوانین هێما بەکار بهێنین بۆ دووبارە نووسینەوەی یاسای نەرمی نواندنی خستە روو بەم شێوەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| Es | : هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنەڕوو |
| % Δ Qs | : گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خستنەڕوو |
| % Δ P | : گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا |
| $Qs_2$ | : بڕی خستنەڕووی دووەم |
| $Qs_1$ | : بڕی خستنەڕووی یەکەم |
| $P_2$ | : نرخی دووەم |
| $P_1$ | : نرخی یەکەم |

**نمونە (١) :-** بڕی خستنە روو لە شمەکێك وەك (X) دابەزی بە ڕێژەی( ٣٥٪) . لە ئەنجامی دابەزینی نرخی هەمان شمەكْ بە ڕێژەی (٢٠٪).

**داواكاری:-** ئایا نەرمی نواندنی خستنە رووی ئەو شمەکە چەندە؟

**وەڵام:-** بە بەکارهێنانی یاسای نەرمی نواندنی خستنە روو :

$$Es = \frac{\% \Delta Qs}{\% \Delta P} = \frac{\frac{٣٥}{١٠٠} -}{\frac{٢٠}{١٠٠} -} = ١,٧٥$$

**تێبینی :** هاوکۆڵکەی نەرمی نواندنی خستنە روو پۆزەتیفە (+) چونکە ڕەنگدانەوەی پەیوەندی بنەڕەتییە کەلە نێوان بڕی خستنە رووی شمەکێك لەگەڵ نرخەکەیدا هۆیەکە پەیوەندیەکی ڕاستەوانەیە

**نمونه (٢):-** بڕی خستنه ڕوو له شمەکی (Y) بەرز بۆوه له (٣) یەکه بۆ (٨) یەکه , ئەمەش له ئەنجامی بەرز بوونەوەی نرخەکەی له (٦) دینار بۆ (١٥) دینار.

**داواکاری:-** نەرمی نواندنی خستنه ڕوو دەربهێنه؟

وەڵام: لەبەر ئەوەی بڕی خستنەروو بەرزبووه لە(٣) یەکه بۆ (٨) یەکه، ئەوەی نرخەکه بەرزبووه له (٦)دینار بۆ (١٥) ب.خس$_٢$= ٨ ب.خس$_١$=٣

ن$_٢$ = ١٥ ، ن$_١$ = ٦

$$\text{نه.خس} = \frac{\text{ب.خس}_2 - \text{ب.خس}_1}{\text{ب.خس}_1} \div \frac{\text{ن}_2 - \text{ن}_1}{\text{ن}_1}$$

$$= \frac{٨-٣}{٣} \div \frac{١٥-٦}{٦} = \frac{٥}{٣} \div \frac{٩}{٦} = \frac{٥}{٣} \times \frac{٦}{٩} = ١,١١$$

## جۆرەکانی نەرمی نواندنی خستنه ڕوو :

أ- چەماوەی خستنەڕووی (نەرمی نواندنی بێ کۆتایی)

ب- چەماوەی خستنەڕووی (نەرمی نواندن)

ج- چەماوەی خستنەڕووی (هاوتایی - ژمارەیەك)

د- چەماوەی خستنەڕووی (نەرمی نواندنی کەم )

هـ- چەماوەی خستنەڕووی (بێ نەرم نواندن)




نەرمی نواندنی خستنه ڕوو دەگۆڕێت بەپێ ی جۆری شمەك , بە واتەیەکی تر پلەی نەرمی نواندنی خستنه ڕوو پشت دەبەستێت (تعتمد) بە

رادەی گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخی شمەکەکەدا. وەجۆرەکانی نـەرمی نوانـدنی خستنە ڕوو بریتین لە مانەی خوارەوە:

### ١- هاوکۆلکەی خستنەڕووی نەرمی نواندن Elastic supply

لەم جۆرەدا گۆڕانی ڕێژەیی لـە بـڕی خـستنە ڕوو گـەورەتر دەبێـت لـە گـۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا, بەم شێوەیە هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنە ڕوو گەورەتر دەبێت لە یەك ژمارەی تەواو ($es>1$). بـۆ نموونـە ئەگـەر هـاتوو نـرخ بـەرز بـۆوە بـە ڕێـژەی (٪١٠) , ئەوا بڕی خستنەڕوو بەرزدەبێتەوە بە ڕێژەی (٪١٥)

## نموونە : بەرهەمە پیشەسازیەکان

خەسلەتەکانی:

١- گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خستنە ڕوو >گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

٢- هاوکۆلکەی نەرمی نواندن گەورەترە لە یەك ژمارەی تەواو.

٣- چەماوەی خستنە ڕوو کەمێك لارە

نموونەی داتایی

| ن | ن. خس |
|---|---|
| ١٠ | ١٥ |
| ١٢ | ٢٠ |

## شیکار

$$\text{هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنەڕوو} = \frac{\text{بری خستنەرووی (٢)-بری خستنەرووی(١)}}{\text{بری خستنەرووی (١)}} \div \frac{\text{نرخی(٢)-نرخی(١)}}{\text{نرخی(١)}}$$

$$= \frac{١٥-٢٠}{١٥} \div \frac{١٠-١٢}{١٠} = \frac{٥}{١٥} \div \frac{٢}{١٠} = \frac{٥}{١٥} \times \frac{١٠}{٢} = \frac{٥}{٣} = ١,٦٦$$

وێنەی داتایی:




## ١- هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنەڕووی بێ کۆتایی:

## Perfectly Elastic Supply

حالەتێکی دەگمەنە چونکە بڕێکی زۆر بۆ فرۆشتن دەخرێتە ڕوو کە چی لە بەرامبەردا هیچ وەلاّم دانەوەیەکی لە نرخ دا نادرێتەوە واتە نرخ هەروەك خۆی دەمێنێتەوە کەواتە خستنە رووی نەرمی نواندنی بێ کۆتایی مانای وایە گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خستنە روو گەورەیە کەچی گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخ دا یەکسانە بە سفر .

خەسلەتەکانی:

١. ڕێژەیی گۆران لەنرخ دا یەکسانە بە صفر .

٢. هاوکۆلکەی نەرمی نواندنی خستنە ڕوو = ∞ .

٣. چەماوەی خستنەڕوو هێڵێکی ڕاستەو تەریبە بۆ تەوەری ئاسۆیی.

**نموونە :**

| ن | ب. خس |
|---|---|
| ١٠ | ٢٠ |
| ١٠ | ٥٠ |

**شیکار:**

$$\frac{٥٠-٢٠}{٢٠} \div \frac{١٠-١٠}{١٠} = \frac{٣٠}{٢٠} \div \frac{٠}{١٠} = \frac{٣٠}{٢٠} \times \frac{١٠}{٠} = \frac{٣٠}{٠} = \infty$$

وێنەی داتایی




هاوکۆڵکەی نەرمی نواندنی خستنەڕووی بێ کۆتایی

## ٢. هاوکۆلکەی خستنەرووی (نەرمی نواندنی کەم):

## Inelastic Supply

دابەزینی زۆر لە نرخدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە بڕی خستنەڕوو بەڕێژەیەکی کەمتر بێت وەك بەروبومە کشتوکاڵیەکان .

خەسلەتەکانی:

- گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خستنەڕوو کەمترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخ دا.
- هاوکۆلکەی یا پلەی نەرمی نواندنی خستنەڕوو کەمترە لە (یەك ژمارەی تەواو)
- چەماوەی خستنەڕوو زۆر لار دەبێتەوە، وە نزیك ترە لە هێڵێکی ڕاست کە تەریب دەبێ بۆ تەوەری ستوونی

**نموونە :**

| ب. خس | ن |
|---|---|
| ١٥ | ١٠ |
| ١٦ | ١٢ |

**شیکار:**

$$\frac{١٦ - ١٥}{١٥} \div \frac{١٢ - ١٠}{١٠} = \frac{١}{١٥} \div \frac{٢}{١٠} = \frac{١}{١٥} \times \frac{١٠}{٢} = \frac{١}{٣} = ٠,٣٣$$

وێنەی داتایی:




### ٤. هوكۆلكەی خستنەڕووی نەرمی نواندنی هاوتا:

*Unitary Elastic Supply*

گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خستنەڕوو تێدا = گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخ دا.

خەسلەتەكانی:

- گۆڕانی ڕێژەیی لەبڕدا یەكسانە بەگۆڕانی ڕێژەیی لەنرخدا .
- هاوكۆلكەی نواندنی نەرمی خستنەڕوو تێدا یەكسانە بە یەك ژمارەی تەواو.

- چەماوەی خستنە ڕوو لە شێوەی هێڵی ناوەڕاستە لە نێوان تـەوەرەکانی ستوونی و ئاسۆیی دا

**نموونە :**

| ب. خس | ن |
|---|---|
| ٤٠ | ٤ |
| ٦٠ | ٦ |




**شیکار:**

$$\frac{٦٠-٤٠}{٤٠} \div \frac{٦-٤}{٤} = \frac{٢٠}{٤٠} \div \frac{٢}{٤} = \frac{٢٠}{٤٠} \text{ x } \frac{٤}{٢} = ١$$

٥. هاوکۆلکەی خستنەرووی بێ نەرمی نواندن: Perfectly Inelastic

واتا هەر گۆڕانێك لە نرخ نابێتە مایەی گۆڕان لە بڕی خستنەڕوو دا.

خەسلەتەکانی

- پلەی یان هاوکۆلکەی نەرمی نواندن= سفر
- نرخ دەگۆڕێت وە بڕی خستنە ڕوو نەگۆڕە .

- چەماوەی خستنەڕوو شێوەی هێڵێکی ڕاست تەریب بۆ تەوەرەی نرخ(ستوونی) .

**نموونە :**

| ب. خس | ن |
|---|---|
| ٢ | ٢ |
| ٢ | ٥ |

**شیکار:**

$$\frac{٢-٢}{٢} \div \frac{٥-٢}{٢} = \frac{سفر}{٢} \div \frac{٣}{٢} = \frac{سفر}{٢} \times \frac{٢}{٣} = سفر$$




**چەماوەی خستنەڕووی بێ نەرم نواندن**

# جۆرەکانی نەرمی نواندنی خستنەڕوو

| پلەکانی نەرمی نواندن | گۆڕانی ڕێژەیی | جۆرەکانی خستنەڕووی نەمی نواندن |
| --- | --- | --- |
| ١ > ب.خس | ∆%ب. خس ∆ % > ن | خستنە ڕووی نەرمی نواندن Elastic |
| ١ < ب.خس | ∆%ب. خس ∆ % > ن | خستنەڕووی کەم نەرمی نواندن Inelastic |
| ١ = ب.خس | ∆%ب. خس ∆ % > ن | خستنە ڕووی نەرمی نواندنی هاوتا Unitary Elastic |
| ٠ = ب.خس | بڕی خستنە ڕوو وەلامی گۆڕانەکان لە نرخ نادەنەوە | خستنەڕووی بێ نەرمی نواندن Inelastic Demand |
| ∞ = ب.خس | بڕی خستنەڕوو بەرادەیەکی گەورە وەلآمی گۆڕانەکان لە نرخدا دەدەنەوە | خستنەڕووی نەرمی نواندنی بێ کۆتایی Perfectly Elastic |

# بەشی پێنجەم

# بیردۆزی ڕەفتاری بەکاربەر
# CONSUMER BEHAVIOR

کەرتی بەکاربردن گرنگترین کەرتەکانی ئابوورییە لە کۆمەڵگادا. وە یەکێکە لە پێکهاتووە سەرەکیەکانی خواستی هەمووەکی لە ئابووری دەوڵەتاندا. بۆیە بیردۆزی ئابووری بایەخ و گرنگی داوە بەخواستی بەکاربەر و ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر ڕەفتاری.

توێژینەوەکان ئەم ڕەفتارە بە ژیریی و هۆشمەندانە لێك دەدەنەوە چونکە ناتوانێت هەموو ئارەزووەکانی بەکاربەر پڕبکاتەوە بەهۆی سنووردارییی داهاتەکەی. بۆیە کاتێك داهاتە نەختینەکەی خەرج دەکات ئەوا بە هۆشیارییەوە کردارەکە ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی زۆرترین ئارەزووەکانی پڕبکاتەوە ((Satisfaction)) واتا بگاتە لوتکەی کەڵك وەرگرتن.

## ئەو هۆکارانەی ڕەفتاری خەرج کردنی بەکاربەر دیاری دەکات:

١- توانستی بەکاربەر بەگۆڕینی ئارەزووەکەی لە بەدەست هێنانی شمەکێ یان خزمەت گوزارییەك بۆ خواستی کاریگەر.

بۆ نموونە کەسێك ئارەزوو دەکات ببێتە خاوەنی ئۆتۆموبیلێکی نوێ، بەڵام کە لە نرخەکەی وورد دەبێتەوە بەرزە هاوکات داهاتەکەی سنووردارە ئەوا ئۆتۆمبیلەکەی پێ ناکرێت و ناتوانێت بە دەستی بهێنێت وە ببێتە خاوەنی، واتا بەدەست هێنانی ئەم ئۆتۆموبیلە نوێیە تەنها ئارەزوویەکە ناچار ئۆتۆموبیلێکی بەکارهاتوو بەنرخێکی کەمتر دەکرێت لێرەدا سەرنج

دەدەین لە حاڵەتی یەکەمدا تەنها ئارەزووە وە لە حاڵەتی دووەمدا بۆتە خواست بۆیە نرخ و داهات لە سنووربەندە سەرەکیەکانی ڕەفتاری بەکاربەرن.

٢- حەزو دەست نیشانکردن Taste and Preferences

ڕەفتاری بەکاربەر جیاوازە لە ڕووی حەز و دەست نیشان کردنی شمەکە جۆراو جۆرەکان چونکە ئەو بەکاربەرەی هەزاران دینار دەدات بۆ کڕینی مافورێکی کۆن، ئەوا ڕەنگدانەوەی حەزو ئارەزوو و دەست نیشان کردنەکەیەتی لەهەمان کاتدا بەکاربەرێکی تر ئامادە نیە پارەیەکی کەمیش بدات بۆ بەدەست هێنانی هەمان شمەك.

## (( ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر ڕەفتاری بەکاربەر ))

١- قەبارەی داهاتی نەختینەیی .

٢- نرخی بازاڕ.

٣- حەز و دەست نیشانکردنی بەکاربەر.

بەمەبەستی ڕۆشنایی خستنەسەر ڕەفتاری بەکاربەر پشت بەست دەبین بە چەند گریمانێك بۆ ئەوەی ئەم بیردۆزە ئاسانتر روون ببێتەوە لەوانە:-

١- ڕەفتاری بەکاربەر ژیرە و هۆشمەندانەیە، واتا هەوڵ دەدات بۆ وەرگرتنی زۆرترین کەڵك و بەدەست هێنانی گەورەترین پڕکردنەوە لەسنووری داهاتەکەی و توانستی دارایی.

٢- نەگۆڕانی حەز و دەست نیشان کردنەکانی بەکاربەر لە شمەك و خزمەت گوزاریەکاندا. ئەگەر شمەکی(A)ی لای پەسەند تر بوو لە شمەکی(B) ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر ئەم ڕەوشە هەتا بۆ ماوەیەکی کورت خایەنیش بێت.

٣- داهاتی بەکاربەر سنووردارە وخەرجی دەکات لەپێناو کرینی شمەك و خزمەت گوزاریە جیاجیاکان واتا لەم داهاتەی پاشەکەوتی نابێت.

٤- بەکاربەر ناتوانێت کار بکاتە سەر نرخەکان و بڕی خواست و خستنەڕوو، چونکە لە ئەنجامی یاساکانی خواست و خستنەڕوو لە بازاڕدا نرخ دیاری دەکرێت.

لە ژێر ڕۆشنایی ئەم گریمانانە"

چۆن بەکاربەر داهاتە سنووردارەکەی دابەش دەکات بۆ ئەوەی زۆرترین پێداویستی و ئارەزووەکانی پڕبکاتەوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پشت دەبەستین بە گرنگترین بیردۆزەکان کە بەشدارن لە خوێندنەوەی ڕەفتاری بەکاربەر کە ئەمانەن:

# بیردۆزی کلاسیکی(( بیردۆزی کەڵك ))
# Utility Theory

## ناوەڕۆکی بیردۆزەکە :

لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەر شمەکێ یان خزمەت گوزاریەك کەڵکێکی دیاری کراوی هەیە. کە پاڵنەرێکی سەرەکیە بۆ خواستی بەکاربەر لەسەر ئەو شمەکەو خزمەت گوزاریە لە سنووری داهات و تواناکەیدا، واتا کەڵك توانستی شتێکە ((شمەك بێت یان خزمەت گوزاری)) بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکی مرۆیی، بۆ نموونە نان ئەو کاتە کەڵکەکە پڕدەکاتەوە کە نانەکەمان لەهەر ساتێکدا دەست کەوێت وبۆ خواردن بەکاری بهێنین .

> **کەڵك:** ئەو ئاستی پڕکردنەوەو تێرکردنەیە کە بەدەست دێت لە ئەنجامی بەکاربردنی یەکە جیاجیاکانی شمەکێ یان خزمەت گوزاریەك لە لایەن تاکەکەسەوە.

## پێوانی کەڵك :

ئابووری ناسەکان چەمکی کەڵکیان بەکارهێناوە بۆ دەست نیشانکردنی شمەکە جیاجیاکان لەلایەن بەکاربەرەوە واتە کەڵك بابەتێکی کەسییە، ئەو کاتە کەڵکی شتێك بەدیار دەکەوێت بە پێ ی پێداویستی تاکە کەسەکە بۆ ئەو شتە، کەواتە بابەتێکی ڕێژەیی مەزەندە کراوە بە پێ ی پێویستیەکانی خەڵك و بە پێ ی جیاوازی تێڕوانینیان بۆ شتەکان دەگۆڕێن بۆیە پێوانی کەڵك بابەتێکی مەزەندەکراوی خەیاڵیە چونکە کەڵك پێوانەی بڕی دابین کردنی پێویستە لە شمەکێکی دیاری کراودا، وە لەبەر ئەوەی خوودی پێداویستی بابەتێکی دەروونیە بۆیە کەڵك بابەتێکی

مەزەندە كراوە، بەلأم ئابووری ناسە كلاسيكيەكان وای بۆ دەچن كە لێرەدا بەكاربەر دەتوانێت پێوەرێكی ژمارەیی وورد بۆ كەڵك بخاتەڕوو لە میانەی بەكاربردنی هەر شمەكێ وە پێ ی دەڵێن یەكەی كەڵك ((Utility)) واتا ئەم بیردۆزە پەیڕەوی پێوانەی چەندایەتی دەكات.

## گریمانەكانی بیردۆزی كەڵك:

١- ڕەفتاری بەكاربەر بەندە بەم گریمانەی كە دەكرێ لە كەڵكە بەدەست هێنراوەكان بپێورێن سەبارەت بە بەكاربردنی شمەك و خزمەت گوزاریە جۆراو جۆرەكان.

٢- بەكاربەر دەتوانێت بەراورد بكات لە نێوان ئەو كەڵكانەی كەلە شمەكە جۆراوجۆرەكان بەدەستی هێناوە ،پاشان كامیان لە هەموویان بەكەڵك ترە هەڵی بژێرێ .

٣- یاسای كەمبوونەوەی كەڵكی سنوورەكی دەگرێتەوە( Law of diminishing marginal utility) واتا هەر چەندە ئەو یەكانەی بەكاربراوە زیاد ببێت ئەوا كەڵكە بەدەست هێنراوەكەی دواین یەكە كەم دەبێتەوە. بۆ تێگەیشتنی بیردۆزەكە پێویستە جیاوازی بكرێت لە نێوان هەردوو چەمكی كەڵك كە ئەمانەن:

### یەكەم :-

> **كەڵكی گشتی:** ئەو ئاستی پڕكردنەوە و تێربوونەیە كە بەكاربەر بەدەستی دەهێنێت لە ئەنجامی بەكاربردنی یەكە بەدوای یەكەكانی شمەكێك لە ماوەیەكی دیاری كراودا

لەخشتەی کەڵکی گشتی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ئەم کەڵکە زیاد دەکات تا دەگاتە لوتکەکەی لە یەکەی بەکاربراوی شەشەمدا دواتر لە یەکەی حەوتەمدا شتێك هیچ ناکات بۆ سەر ئەم کەڵکە واتا لێرەدا سنورێك لە زیاد کردنی کەڵکی گشتیدا هەیە بە شێوەیەك بەکاربەر کەڵکێکی زیاتر بەدەست ناهێنێت لە بەکاربردنی یەکەی زیادکراو لە شمەکەکەدا، ئەو سنوورە پێی دەڵێن((خاڵی تێربوون)) دوای ئەم خاڵە کەڵکی زیاد کراو نێگەتیڤ دەبێت، خشتەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بەکاربردنی یەکەی هەشتەم کەڵکی سنوورەکی نێگەتیڤ بەدەست دەهێنێت بەبڕی((٥)) کەڵك.

| ژمارەی یەکەکانی سێو | کەڵکی گشتی شمەکەکە |
|---|---|
| ١ | ١٠ |
| ٢ | ٢٢ |
| ٣ | ٤٥ |
| ٤ | ٥٧ |
| ٥ | ٦٥ |
| ٦ | ٦٧ |
| ٧ | ٦٧ |
| ٨ | ٦٢ |

**خشتەی کەڵکی گشتی**




**وێنەی کەڵکی گشتی**

لەمیانەی خشتەو نواندی بە وێنەی بە داتا بوونی پێشوودا دەکرێ گرنگترین خەسڵەتەکانی چەماوەی کەڵکی گشتی پووخت بکەینەوە لەمانەی خوارەوەدا:

١- کەڵکی گشتی زیاد دەبێت بە زیاد بوونی بەکاربردنی ژمارەی یەکەکانی شمەکدا.

٢- زیادبوونی کەڵکی گشتی Tu بە تێکڕایی کەمبوونەیە هەرچەند ژمارەی یەکە بەکاربردنەکان زیاد بێت.

٣- زیاد بوونەکە بە تێکڕایی لە کەمبوونەوەدا بەردەوام دەبێت تاکو لوتکەی ئاستی دابین کردن لێرەدا Tu نەگۆڕە وەك یەکەکانی پێشتر لەخشتەکەدا وە Tu=٦٧.

٤- بەردەوام بوون لە بەکاربردنی یەکەکانی شمەکێکدا دوای لوتکەی دابین کردن دەبێتە مایەی کەمبوونەوەی Tu هەروەك لە یەکەی هەشتەمدا هاتووە لە خشتەکەدا وە Tu= ٦٢.

## کەڵکی سنورەکی: margined utility

کەڵکی سنوورەکی:

گوزارشتە لەو گۆڕانکاریەی لە کەڵکی گشتیدا ڕوو دەدات کاتێك بڕە بەکاربردنەکانی شمەکێك دەگۆڕێن. وە پێوانەکەی بەم شێوەی خوارەوەیە:

$$\text{کەڵکی سنوورەکی} = \frac{\text{گۆڕان لە کەڵکی گشتی}}{\text{گۆڕان لە ژمارەی یەکە بەکاربراوەکان}}$$

یان:

$$\text{ك.س} = \frac{\Delta\ \text{ك گ}}{\Delta\ \text{ب}} = \frac{\text{ك گ}_{٢} - \text{ك گ}_{١}}{\text{ب}_{٢} - \text{ب}_{١}}$$

$$MU = \frac{\Delta\ Tu}{\Delta\ Q} = \frac{Tu_{٢} - Tu_{١}}{Q_{٢} - Q_{١}}$$

کەڵکی سنوورەکی: Mu

گۆڕان لە کەڵکی گشتی: ΔTu

: گۆڕان لە ژمارەی یەکە بە کاربراوەکان لە شمەکێکدا: ΔQ

وە بۆ گەڕانەوە بۆ نموونەکەی پێشوو، دەکرێ کەڵکی سنوورەکی بەدەست بهێنیت وەك لە خوارەوەدا هاتووە:

**دووەم :-**

**کەڵکی سنوورەکی**: ئەو ئاستی پڕکردنەوە و تێربوونە زیادەیە کە بەکار بە دەستی دەهێنێت لە ئاکامی بەکاربردنی زیادەیەك لە یەك یەکە ( یەك دانە) لە شمەکێك).

| ژمارەی یەکەکانی سێوQ | ک.گ.Tu | ک. س.Mu |
|---|---|---|
| ١ | ١٠ | ١٠ |
| ٢ | ٢٢ | ١٢ = ١٠-٢٢ |
| ٣ | ٤٧ | ٢٥ = ٢٢-٤٧ |
| ٤ | ٥٧ | ١٠ = ٤٧-٥٧ |
| ٥ | ٦٥ | ١٠= ٦٥-٧٥ |
| ٦ | ٦٧ | ٢ = ٦٥-٦٧ |
| ٧ | ٦٧ | ٠ = ٦٧-٦٧ |
| ٨ | ٦٢ | ٥- = ٦٢-٦٧ |

لەخشتەکەی سەرەوەدا بۆمان روون دەبێتەوە کەوا کەڵکی سنوورەکی Mu زیاد دەبێت تاکو دەگاتە بەرزترین بەها دواتر کەم دەبێتەوە تاکو دەگاتە سفر، لە دواتردا بەهای نێگەتیف (-) دەبێت واتا سیمای سەرەکی کەڵکی سنوورەکی دەکەوێتە ژێر ڕکێفی یاسای کەمبوونەوەی کەڵکی سنوورەکی. لەخشتەی سەرەوەدا سەرنجمان دا(Mu) زیادبووە تاکو گەیشتە بەرزترین بەهای لە کاتی بەکاربردنی یەکەی سێ یەمدا کە (Mu =٢٥) دواتر کەم دەبێتەوە تاکو دەگاتە(سفر) لە کاتی بەکاربردنی یەکەی حەوتەم دا.

**یاسای کەمبوونەوەی کەڵکی سنووەرکی :** لە کاتی بەکاربردنی یەکە بە دوای یەکەکانی شمەکێك ، ئەوا ئەو ئاستی پڕکردنەوە و تێر بوونە زیادەیەی کە بەکار بەدەستی دەهێنێت جار لە دوای جار ڕوو لە کەمبوونەوە دەکات هەتاوەکو بەردەوام بێت لە بەکاربردنی هەریەکەیەکی دیکەی ئەو شمەکە .







**پەیوەندی نێوان کەڵکی گشتی کەڵکی سنوورەکی**

## بیردۆزی نوێ ((بیردۆزی چەماوە لێکچووەکان))
## Indifference Curves Theory

ئەم بیردۆزە بەندە لەسەر بنەمای ڕیزبەندیەوە واتا ئەم کەڵکانەی بەدەست دەهێندرێت لە تێکەڵاوی شمەکەکاندا((دوو شمەك)) تێك هەڵکێشراون لەگەڵ یەکتردا. وەهەروەها بەکاربەر ناتوانێت پێوەرێکی ژمارەیی ببەخشێتە کەڵکەکان بەڵکو بۆی مەیسەر دەبێت ڕیزبەندێکی بەرز یان نزم ببەخشێت. بیردۆزی چەماوە لێك چووەکان دوو هۆکاری سەرەکی بەکاردەهێنێت بۆ شی کردنەوەی ڕەفتاری بەکاربەر کەوا ئەمانەن:

١- چەماوە لێك چووەکان.

٢- هێلی بوودجە(دەرامەت)

١- چەماوەی لێك چوو: نواندنی داتایی ئەو خاڵانەن کە چەند شمەکێك دەنوێنن، ئەگەر بەکاربەر بەکاریان بهێنێت هەمان ئاست لە تێرکردن و پڕکردنەوەی پێ دەبەخشێت. واتا ئەو خاڵانەی دەکەونە سەر چەماوەی لێك چوو یەکسانن لە ڕووی کەڵکدا. بۆیە ئەم چەماوەیە بەم ناوە هاتووە و نانراوە.

ئەگەر بەکاربەرێك ڕووبەڕووی چەند شمەکێك بێتەوە کە هەمان ئاستی تێرکردن و پڕکردنەوەی پێ دەبەخشن بۆیە بەلای ئەمەوە لێك چوون و وەك یەك وان . گریمان دوو کۆمەڵە شمەکی (A,B) هەن , هەریەك لەو کۆمەڵە شمەکانیش بڕێکی تری دیاری کراو لە دوو شمەکی دیکەی هەیە کە بریتین لە (X ، Y)، جا لەگەڵ (A) بێت یا خود لەگەڵ (B) واتە هەمان بڕی هەردوو شمەکی (X,Y) دەکرێتەوە کە (B) لە خۆی

گرتووه ، یاخود ئەگەر (A) بڕێکی گەورەتری لە (Y) لە خۆ گرت ، ئەوا دەبێ بڕێکی کەمتری لە (X) لە خۆ گرتبێ بە بەراورد لەگەڵ (B) هەروەك لە هێلکاری نەخشەی چەماوەی لێك چوو دیارە کە کۆمەڵە شمەکی (A) بڕێکی گەورەتر لە شمەکی (Y) لە خۆ دەگرێ بە بەراورد کۆمەڵە شمەکی (X) ، جا بەیەکەوە گەیاندن و بەیەکەوە بەستنی (A) وە (B) دەگەینە چەماوەی لێك چوو.

| پرتەقاڵ | سێو | کۆمەڵەی |
|---|---|---|
| ١٥ | ١ | A |
| ٩ | ٢ | B |
| ٥ | ٣ | C |
| ٤ | ٤ | D |

نواندنی خشتە بە داتا یەکەکانی پرتەقاڵ لەسەر تەوەری ستوونی دادەنرێت وە یەکەکانی سێو لەسەر تەوەری ئاسۆییدا.




٢- نەخشەس چەماوەی لێك چوو:- ئەگەر بەکار بەرێك روو بە رووی سێ کۆمەڵە شمەکی (A,B,C) بێتەوە ،کۆمەڵی (C) بڕێکی گەورەتری لە خۆ دەگرت لە چاو هەردوو شمەکی (X,Y) گەورەتر لەوەی کە کۆمەڵی (B) لە خۆ دەگرێ ، ئەو کاتە بەکاربەر کۆمەڵەی (C) بەلاوە باشترە لە چاو (A) چونکە ئاستێکی تێرکردن و پڕکردنەوەی بەرز تری پێ دەبەخشێ .

هەروەها کۆمەڵی (C) دەکەوێتە سەر چەماوەی لێ چووی بەرزتر (III) لەوەی کە (A) دەکەوێتە سەری . بە پێچەوانەشەوە ئەگەر کۆمەڵەی (A) بڕێکی گەورەتری لەخۆ دەگرت لەچاو هەردوو شمەکی (X,Y) گەورەتر لەوەی کە کۆمەڵەی (B) لە خۆ دەگرێ ، ئەو کاتە بەکاربەر کۆمەڵی (A) بەلاوە باشترە لە چاو (B) ئەو کاتە دەبێ (A) بکەوێتە سەر چەماوەی لێك چووی ناوەند (II)کە بە بەرزتر لە (B) چونکە دەکەوێتە سەر چەماوەی لێك چووی خوارەوە (I) هەروەك لە هێلکاریەکەی بەرامبەردا ڕوون کراوەتەوە.

## نەخشەی چەماوەی لێك چوو: (Indifference Map)

کۆمــەلێك لــە چــەماوەی لێــك چــوونن هەریــەکێکیان گوزارشــت لــە ئاستێکی دابین کردنی جیا لــەوەی تــردا دەکــەن.هەمیشە بەکاربــەر هــەوڵ دەدات ئــەم چــەماوە لێــك چــووانە پەســەند بکــات کــە زۆرتــرین ئاســتی پڕکردنــەوەی هەیــە. ئــەو بنــەما گشتیەی کــە خــۆی دەســەپێنێ بەســەر نەخشەی چەماوەی لێك چوو ئەوەیە کە :–

هەرچــەندە چــەماوەی لێــك چــوو لــەخاڵی بنــەڕەت (گۆشــەی سفر)دووربکەوێتەوە، ئەوا پڕکردنەوەیەکی زۆرتر دەبەخشێ. هەرچەندیش چەماوەی لێکچوو لەخاڵی بنەڕەت (خاڵی سفر) نزیك بێتەوە، ئەوا ئاستێکی پڕکردنەوەی کەمتر دەبەخشێ .




### خەسڵەتەکانی چەماوە لێکچووەکان:

١– لەسەرەوە بۆ خوارەوە دادەبەزێت وە ئاراستەکەی لە لای چــەپەوە بــۆ لای ڕاستەوەیە و بەئاراستەی خاڵی بنەڕەتیدا کوڕ دەبێتەوە.

٢– چەماوە لێك چووەکان کوڕ دەبنەوە لەلای خاڵی بنەڕەت

٣- چـەماوە لێـك چـووەكان ناپـچڕێن ، چـونكە چـەماوەی لێكچوو لـە نەخـشەی لێـك چـوو ئاسـتێكی پڕكردنـەوە دەنـوێنیٚ كـە جیـاوازە لەچەماوەكانی تر.

٤- هێڵی تەرازوو (داهات)

گریمان داهاتی بەكاربەرێك مانگانە ٥٠٠٠٠ دینارە ولە دووشمەكدا خەرجی دەكات (y , X) جا ئەگەر نرخی (X) ٢٠٠ دینار بێت ونرخی (y) ١٠٠ دینار بێت، ئەوا بەكاربەرەكە تووشی سیٚ بۆ چوون دەبیٚ :-

١- بۆچوونی یەكەم :- ئەوەیە كە هەموو داهاتەكەی لە (X) خەرج بكات، ئەوكاتە ئەو بڕەی بەدەستی دێنیٚ = ٥٠٠٠٠/٢٠٠ وهیچ لە (y)، خاڵی Aدەكەوێتە سەر هێڵەكە .

٢- بۆچوونی دووەم :- ئەوەیە كە هەموو داهاتەكەی لە (y) خەرج بكات، ئەو كاتە ئەو بڕەی بەدەستی دێنیٚ = ٥٠٠٠٠/١٠٠ و هیچ لە (X) ، خاڵی (B) دەكەوێتە سەر هێڵەكە .

٣- بۆچوونی سێیەم :- داهاتەكەی بۆ (X,y) دابەش بكات، جا ئەگەر بەیەكسانی دابەشی كرد ئەوا (٢٥٠٠٠/٢٠٠ = ١٢٥ لەشمەكی X) و (٢٥٠٠٠/١٠٠= ٢٥٠ لەشمەكی y) بەدەست دێنیٚ، خاڵی C دەكەوێتە سەر هێڵی تەرازووەكە .

وەك لەم هێلكاریەدا دیارە كەبـەهۆی بەیەكـەوە گەیانـدنی خاڵـەكانی (A,C,B) كەسیٚ بۆ چونەكەیە لە بەردەم بەكاربەر بۆ خەرجكردنی

داهاتەکەی واتە هێڵی ACB پێی دەوترێ هێڵی تەرازوو (داهات) ئەم هێڵی تەرازووەش لەسەر دوو شت وەستاوە:

٢- داهاتی نەختینەیی بەکاربەر

٢- نرخی شمەك لەبازاڕدا .




**تێکڕای سنورەکی بۆ شوێن گرتنەوە Mariginal rate of subaction:**

ئـەو بڕەیـە کـە لـە شمەکێکـدا وازی لـێ دەهێنرێـت بەرامبـەر بەدەست هێنانی یەکەیەك لە شمەکێکی تردا.

## هاوسەنگی بەکاربەر Consumer Equilibrium :

هەمیـشە بەکاربـەر ئامـانجی ئەوەیـە گـەورەترین پڕکردنـەوەکانی بەدەست بهێنێت لەسایەی داهاتی رەخساوی تەرخان کراو. بۆ خەرج کـردن و لـە سـایەی نرخـی شمـەك لـە بـازاڕدا، واتـە دەیـەوێ بگاتـە حاڵـەتی هاوسەنگی. ئەم بیردۆزە بۆ هاوسەنگی بەکاربەر پشت دەبەستێت بە :

أ. نەخشەی لێك چوو .          ب.هێڵی تەرازوو داهات .

هاوسەنگی بەکار بەر بەهۆی بوونی دوو مەرج دێتە دی :-

١- کەڵکی سنوزرەکی یەك یەکەی دراو دەبێ یەکسان بێت بۆ هەموو شمەکێك ، کە ئەمەش پێ دەڵێن :( یاسای کەڵکە یەکسانەکان )،واتە:

$$\frac{MUx١}{Px١} = \frac{MUx٢}{Px٢} = \ldots\ldots \frac{MUxn}{Pxn}$$

٢- داهاتی بەکاربەر دەبیَ هەمووی بۆ کڕینی ئەو شمەکە بیَت کە بەکاربەرەکە دەیەویَ و پیَویستی پیَیەتی واتە :

$$Px_1\,qx_1 + Px_2\,qx_2 + \cdots\cdots + Pxn\,qxn = M$$

تیَبینی :(M) داهاتی بەکاربەرە.

حاڵەتی هاوسەنگی دیاری دەکریَ بە جیَ بەجیَ کردنی هیَڵی تەرازوو بەسەر نەخشەی (چەماوەی ) لیَك چوو :

پرسیار : ئایا ئەو کۆمەڵە شمەکانە کامانەن کە حاڵەتی هاوسەنگی بۆ بەکاربەر بەدی دەهیَنن؟

وەلاَمی ئەم پرسیارە بە بەکارهیَنانی ئەم هیَلکاریە دەدریَتەوە کە هاوسەنگی بەکاربەر دەنویَنیَ. هاوسەنگی بەکار بەر ئەو کاتە دیَتە دی کە بتوانیَ کۆمەڵە شمەکی (C) بەدەست بیَنیَ کە ($X_1, Y_1$) دەگریَتەوە ، چونکە ئەو کۆمەڵە بەرزترین ئاستی تیَرکردن و پڕکردنەوە بۆ بەکاربەر بەدی دەهیَنیَ، هەرچەندە کە (F) ئاستیَکی پڕکردنەوەی بەرزتر و زیاتر لە (C) دەبەخشیَ کەچی لە دەرەوەی تواناکانی بەکاربەردایە.

بەلاَم کۆمەڵە شمەکی (E) ئاستیَکی کەمتر تیَرکردن و پڕکردنەوە لە چاو (C) دەنویَنیَ، کەچی هیَشتا بەکاربەر لە توانای دایە بکاتە ئاستیَکی بەرزتر و زیاتر کە خۆی لە ( چەماوە لیَك چووەکان ) دەنویَنیَ (II).

بۆیە (C) خاڵی هاوسەنگی بەکار دەنویَنیَ .

کەواتە مەرجی هاوسەنگی :

لاربوونەوەی چەماوەی لێك چوو = لاربوونەوەی هێلی تەرازوو( داهات)



## بەشی شەشەم

## تێچوون و بەرهەم هێنان

### تێچوون
### COSTS

بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لە تێچوون((ئەو قوربانیەیە کە پێویستە ئەنجام بدرێت یان پێشکەش بکرێت لە پێناو بەدەست هێنانی شتێکدا)) وە سروشتی ئەم قوربانیە دەکرێ بەرجەستە ببێت وەیان نابێت، بابەتیە یاخوود بابەتی نیە، دەکرێ بەشێوەی دراو بێت کاتێك بەرهەم هێنەر وازی لێ دەهێنێت بەرامبەر بە بەدەست هێنانی کەرەستەو بنەماکانی بەرهەم هێنان.

بۆ ئەوەی زیاتر لە چەمکی تێچوون بگەین پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان تێچوون بە واتای گشتی و واتا ئابووریەکەی.

١-تێچوون بەواتا گشتیەکەی: ئەو برە پارەیە کەوا بەرهەم هێن لە ئەستۆی دەگری لە پێناو بەدەست هێنانی بنەماکانی بەرهەم هێنان و پێویستیە جیاجیاکاندا بۆ بەرهەم هێنانی برێکی سنووردار لە شمەك و خزمەت گوزاریەکان وەك مووچە ، و نرخی کەرەستەی خاو ، وە ووزە وەك کارەبا ، و ئاو و کرێ ی گواستنەوە و رێکلام و باج و پێشینە. ئەم تێچوونە پێیان دەوترێت((تێچوونی ئاشکرا یان بەرچاو)) وە یاخوود((تێچوونی ژمێریاریی)) Accounting costs.

٢-تێچوونەکان بەواتا ئابووریەکەی: ئەو خەرجیانەن کەوا دامەزراو و دەزگاکان بە ئاشکرا نایدەن، بەڵکو لە دەیگرنە ئەستۆ بۆ هاندانی خاوەن

بنەماکانی بەرهەم هێنان بە مەبەستی بەشداربوون، لە کرداری بەرهەم هێناندا.وە نموونەی تێچوونە شاراوەکان((Implicit cost)) کرێ ی بینای دامەزراوەکان و مووچەی خاوەن کار کەوا خاوەنی دامەزراوەکەیە.

**تێچوونەکان بەواتا ئابووریەکەی بریتییە لە :**

- تێچوونە ئاشکراکان"بەرچاوەکان" تێچوونی بنەماکانی بەرهەم هێنان کە دامەزراوەکان خاوەنیان نین.
- تێچووە شاراوەکان: تێچووی ئەو بنەمایانەی بەرهەم هێنانە کە خاوەندارێتیان دەگەرێتەوە بۆ دامەزراوەکە.

## قازانجی ئابووریی : Economic Profits

دەکرێ بەهای قازانج هەژمار بکرێت لە دۆزینەوەی جیاوازی لە نێوان سەرجەمی دەسهات و Total Revenue (TR) و سەرجەمی تێچوون (TC) Total costs لێرەدا تێروانینی ئابووری ناسان جیاوازە لەگەڵ تێروانینی ژمێریاران دەربارەی بابەتی قازانج.

قازانجی ژمێریاری– Accounting Profit جیاوازی نێوان سەرجەمی دسهات و تێچوونی ئاشکرایە"بەرچاوەکان"

سەرجەمی قازانجی ژمێریاری = سەرجەمی دسهاتی دامەزراو - سەرجەمی تێچوونی ئاشکرا "بەرچاوەکان"

بەڵام **قازانجی ئابووری**:بریتی یە لە جیاوازی نێوان سەرجەمی دەسهات و تێچوونی ئاشکراو شاراوە .

قازانجی ئابووری = سەرجەمی دەسهاتی دامەزراوەکە - تێچوونە ئابووریەکانی دامەزراوەکە

## ئەو هۆكارانەی كە تێچوونەكانی بەرهەم هێنان دیاری دەكەن :

١- نرخی كەرەستەكان یان ئەو بنەمایانەی بەرهەم هێنان كەبەكاردێن لە كرداری بەرهەم هێناندا .

٢- شێوازەكانی بەرهەم هێنان واتا تەكنیكی بەكارهێنراو لەكرداری بەرهەم هێناندا .

٣- نرخی بەرهەم .

٤- چۆنیەتی بەڕێوەبردن .

٥- شوێن .

## جۆرەكانی تێچوون :

بەر لەوەی تێچوونەكان پۆلێن بكەین پێویستە جیاوازی بكرێت لەنێوان ماوەی كورت خایەن كە دامەزراوەكان بۆیان نارەخسێت سەرجەم بنەماكانی بەرهەم هێنان بگۆڕن. لەم ماوەیەدا هەندێك لەم بنەمایانە نەگۆڕن وە ئەوانەی تر دەگۆڕدرێن . وە ماوەی درێژ خایەن كە سەرجەم بنەماكانی بەرهەم هێنان دەگۆڕێن، بۆیە دەكرێ ئەو تێچوونانەی دامەزراوەكە لە ئەستۆیان دەگرێ بۆ بەرهەم هێنانی شمەك و خزمەت گوزاریەكان دابەش بكرێن لە ماوەی كورت خایەندا بۆ ئەم جۆرانە :-

### ١- تێچوونە نەگۆڕەكان:

### (TFC) Total Fixed Cost

ئەو تێچوونانەن كە ناگۆڕێن بە گۆڕینی قەبارەی بەرهەم هێنان ، واتا سەربەخۆیە لەگەڵ قەبارەی بەرهەمدا . بۆ نموونە كرێ ی بینا وە سووی

سەرمایەی قەرزکراو ، ئەم تێچوونانە دامەزراوەکان لە ئەستۆیان دەگرن ئینجا ئەم دامەزراوە بە ووزەی تەواوی یان بەناتەواوی کاربکات وەیا خوود لە بەرهەم هێناندا بوەستێت یاخود نا . سەیری وێنەی خوارەوە بکە .

وێنەی (١) چەماوەی تێچوونە نەگۆڕەکان




٢- تێچووە گۆڕاوەکان:

Total Variable Cost TVC

ئەم تێچوونانە پەیوەستن بە قەبارەی بەرهەم هێنان چ بەزێدەیی بێت یان بە کەمی بێت.، بۆ نموونە کەرەستەی خاو ، یان زیادکردن و کەم کردنەوەی ژمارەی کرێکاران ......

ئەگەر بڕی بەرهەم هاتوو یەکسان بوو بە سفر (هیچ) ئەوا تێچوونە گۆڕاوەکان یەکسانە بە سفر (هیچ) سەیری وێنەی خوارەوە بکە .

وێنەی (١) چەماوەی تێچوونە گۆڕاوەکان




-٣ سەرجەمی تێچوون: Total Cost (TC):

بریتـی یـە لـە کۆکردنـەوەی تێـچوونە گۆڕاوەکـان ونـەگۆڕەکان کـە دامەزراوە کە لە ئەستۆی دەگرێت، سەیری وێنەی خوارەوە بکە .



### ٤- تێکڕایی تێچوون و تێچوونی سنوورەکی :

شی کردنەوەی تێکڕایی تێچوون و تێچوونی سنوورەکی گرنگی یەکی گەورەی هەیە چونکە پەیوەستن بە هاوسەنگی پرۆژەکەوە.دەکرێ دابەش بکرێت بەم جۆرانەی خوارەوە:-

#### أ-تێکڕایی تێچوونە نەگۆڕەکان:

(AFC) Average Fixed Cost

بریتی یە لەو بەشەی کە یەکەی بەرهەم هاتوو لە تێچوونە نەگۆڕەکە بەری دەکەوێت لە ئەنجامی دابەش کردنی تێچوونە نەگۆڕەکان بەسەر بڕی بەرهەم هاتوو.

$$\text{تێکڕایی تێچوونی نەگۆڕ} = \frac{\text{تێچوونی نەگۆڕ}}{\text{بڕی بەرهەم هاتوو}}$$

یان

$$AFC = \frac{TFC}{Q}$$

وێنەی (٣) چەماوەی تێکرای تێچووە نەگۆڕەکان




ب- تێکڕایی تێچوونی گۆڕاو: Average Variable of CostAVC

بریتی یە لەو بەشەی کە یەکەی بەرهەم هاتوو لە تێچوونی گۆڕاو بەری دەکەوێت لە ئەنجامی دابەش کردنی تێچوونی گۆڕاو بەسەر بڕی بەرهەم هاتوودا:-

$$\text{تێکڕایی تێچوونی گۆڕاو} = \frac{\text{تێچوونی گۆڕاو}}{\text{بڕی بەرهەم هاتوو}}$$

یان:

$$AVC = \frac{TVC}{Q}$$

چەماوەی تێکڕایی تێچوونی گۆڕاو لە شێوەی پیتی (U) خۆی دەنوێنێت کە لەسەرەوە بۆ خوارەوە وە بۆ لای ڕاست تاڕادەیەك درێژ

دەبێتــەوە دواتــر بــەرز دەبێتــەوە  بــۆ ســەرەوە وەك لــە وێنــەی خــوارەوە هاتووە.

وێنەی (١) چەماوەی تێکرای تێچوونی گۆڕاو




ج- تێکڕایی سەرجەمی تێچوون: ATC Average Total Cost

بەشی یەکەی بەرهەم هاتووە لە سەرجەمی تێچوون . بە یـەکێك لـەم دوو ڕێگایانەی خوارەوە بەدەست دەهێنرێت .

**یەکەم:** لە ڕێگای کۆکردنەوەی تێکرایی تێچوونی نەگۆڕ لەگەڵ تێکرایی تێچوونی گۆڕاو.

$$ATC = AFC + AVC$$

**دووەم:** لەڕێگای دابەش کردنی سەرجەمیتێچوون بەسەر قەبارەی بەرهەم.

$$\text{تێکرایی سەرجەمی تێچوون} = \frac{\text{سەرجەمی تێچوون}}{\text{قەبارەی بەرهەم}}$$

یان

$$ATC = \frac{TC}{Q}$$

یان

تێکڕایی تێچوونی نەگۆڕ + تێکڕایی تێچوونی گۆڕاو = تێکرای سەرجەمی تێچوون

یان

$$ATC = AFC + AVC$$

چەماوەی ناوەندی سەرجەمی تێچووەکان لە شێوەی چەماوەی تێکڕایی تێچوونی گۆڕاودایە, بەڵام خۆی دەنوێنێت بەدووری ستوونی یەکسان بێت بە تێچوونە نەگۆڕەکان وەك لەم وێنە خوارەوەدا هاتووە .




د- تێچوونی سنوورەکی: MC Marginal Cost

بڕی گۆڕانە لە تێچوونی هەمووەکی دا ((نەگۆڕ + گۆڕاو )) لە ئەنجامی گۆڕان لە قەبارەی بەرهەم هێنان بەیەك یەکە . وەپێوانەی تێچوونی سنوورەکی بەدابەش کردنی گۆڕان لە تێچوونی هەمووەکی بەسەر گۆڕان لە بڕی بەرهەم هاتوودا بەر دەست دەکەوێت .

گۆڕان لە تێچوونی هەمووەکی

تێچوونی سنوورەکی = ———————————

گۆڕان لە بڕی بەرهەم هاتوو

یان

$$MC = \frac{\Delta TC}{\Delta Q}$$

چەماوەی تێچوونی سنوورەکی بەرەو دابەزین ئاڕاستە دەبێت تاکو دەگاتە کەمترین تێچوون دواتر بەرز دەبێتەوە لە کاتی زێدە کردنی یەکە بەرهەم هێنراوەکاندا . وەك لەم وێنەدا خۆی دەنوێنێت .




**پەیوەندی نێوان تێچوون و قەبارەی بەرهەم**

بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێگای هەژمارکردنی جۆرەکانی تێچوونە جیاجیاکان وە تێگەیشتنی پەیوەندی لەگەڵ قەبارەی بەرهەم دا پشت دەبەستین بەم خشتەی خوارەوە:

### خشتەی پەیوەندی نێوان تێچووەکان و قەبارەکانی بەرهەم.

| ژمارەی یەکەی بەرهەم هاتوو Q | ت.ن تێچوونی نەگۆر TFC | س.ت تێچوونی گۆڕاو TVC | ت.ت.ن سەرجەمی تێچوون TC | ت.ت.گ تێکرایی تێچوونی نەگۆر AFC | ت.ن.گ تێکرایی تێچوونی گۆڕاو AVC | ت.س.ت تێکرایی سەرجەمی تێچوون ATC | ت.س تێچوونی سنوورەکی MC |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٥٠ | ٠ | ٥٠ | — | — | — | — |
| ١ | ٥٠ | ٤٠ | ٩٠ | ٥٠ | ٤٠ | ٩٠ | ٤٠ |
| ٢ | ٥٠ | ٧٠ | ١٢٠ | ٢٥ | ٣٥ | ٦٠ | ٣٠ |
| ٣ | ٥٠ | ٩٠ | ١٤٠ | ١٦,٦ | ٣٠ | ٤٦,٦ | ٢٠ |
| ٤ | ٥٠ | ١١٠ | ١٦٠ | ١٢,٥ | ٢٧,٥ | ٤٠ | ٢٠ |
| ٥ | ٥٠ | ١٢٥ | ١٧٥ | ١٠ | ٢٥ | ٣٥ | ١٥ |
| ٦ | ٥٠ | ١٣٥ | ١٨٥ | ٨,٣ | ٢٢,٥ | ٣٠,٨ | ١٠ |
| ٧ | ٥٠ | ١٤٠ | ١٩٠ | ٧,١ | ٢٠ | ٢٧,١ | ٥ |
| ٨ | ٥٠ | ١٧٠ | ٢٢٠ | ٦,٢ | ٢١,٢ | ٢٧,٤ | ٣٠ |
| ٩ | ٥٠ | ٢٢٥ | ٢٧٥ | ٥,٥ | ٢٥ | ٣٠,٥ | ٥٥ |
| ١٠ | ٥٠ | ٣٠٠ | ٣٥٠ | ٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٧٥ |

لەم خشتەیەدا دەردەکەوێت کەستونی یەکەم دەربڕی یەکەکانی بڕی بەرهەمە ستونی دووەم تێچوونی نەگۆڕەو ناگۆڕێت هەرچەندە بڕی بەرهەم زیاد بکات .ستونی سێ یەم تێچوونی گۆڕاوە لەگەڵ زیاد بوونی بڕی بەرهەم دا زیاددەکات ستونی چوارەم سەرجەمی تێچوون دەردەخات کەپێك دێت لە تێچوونی گۆڕاوو نەگۆڕ.

ستونی هەشتەم تێچوونی سنورەکی یە کەدەتوانرێت دەربهێنرێت بە دەرکردنی سەرجەمی تێچوونی یەکەم لەسەرجەمی تێچوونی دووەم وە بەو جۆرە ستوونی حەوتەم تێکرای تێچوونە .وەك لەم شێوەیەدا دەردەکەوێت.

لەخشتەی سەرەوەدا تێبینی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەین:

١.تێچوونی نەگۆڕ ناگۆڕێ بە گۆڕانی قەبارەی بەرهەم بەڵکو بەنەگۆڕاوی دەمێنێتەوە هەتا ئەگەر قەبارەی بەرهەم سفریش بێت، ئەمەش لە پابەند بوونە پێویستەکان خۆی دەنوێنێت سەبارەت بە دامەزراوەکان بەبێ ڕەچاو کردنی قەبارەی بەرهەم بەڵام نەختینەی تێکرای تێچوونی نەگۆڕ کەم دەبێتەوە بەزێدە بوونی بەرهەم تاکو دەگاتە نزمترین بەهاکەی ((٥ یەکەی نەختینەیی)) لەکاتی بەرهەم هێنانی (١٠) دە یەکەدا.

٢.تێچوونی گۆڕاو زیاد دەبێ بە زێدە بوونی بەرهەم ، بەڵام تێکرای تێچوونی گۆڕاو لەسەرەتادا کەم دەبێتەوە لەگەڵ زێدە بوونی بەرهەم تاکو دەگاتە نزمترین ئاستی دواتر زیاد دەبێت .

٣.سەرجەمی تێچوون بەرەو زێدەبوون ئاراستە دەکرێت هەر چەندە قەبارەی بەرهەم زێدە دەبێت وە دەبێتە ((٣٥٠)) لە ئاستی بەرهەم هێنانی (دە یەکە) .

٤.تێچوونی سنوورەکی بە ئاڕاستەی کەم بوونەوەیە تاکو دەگاتە نزمترین بەهاکەیەوە دواتر زێدە دەکات.

وە دەکرێت نواندنی چەماوەکانی تێچوون بکرێت بە وێنە بەم شێوەیەی خوارەوە:




تێکرایی سەرجەمی تێچوون، تێکرایی تێچوونی نەگۆڕ

تێکرایی تێچوونی گۆڕاو ، تێچوونی سنوورەکی

## پوختەی تێچوون
## A Compact Glossary of Costs

| زاراوە | هێما | پێناسە | هاوکێشە |
|---|---|---|---|
| تێچوونی نەگۆڕ<br>Fixed Cost | ت.ن | تێـــچوون ســـەربەخۆیە ناگۆڕێـت لەگـەڵ ئاسـتی بەرهەمدا | |
| تێچوونی گۆڕاو<br>Variable Cost | ت.گ | تێـــچوون دەگۆڕێـــت بەگۆڕانی بەرهەم | |
| سەرجەمی تێچوونی نەگۆڕ<br>Total Fixed Cost | س.ت.ن | تێـــچوونی نـــەگۆڕی کەرەستە | |
| سەرجەمی تێچوونی گۆڕاو<br>Total Variable Cost | س.ت.گ | تێـــچوونی گـــۆڕاوی کەرەستە | |
| سەرجەمی تێچوون<br>Total Cost | س.ت | تێـــچوونی ســـەرجەم کەرستەکان | TC=TFC+TVC |
| تێکرای تێچوونی نەگۆڕ<br>Average Fixed Cost | ت.ت.ن | ســـەرجەمی تێـــچوونی نـــەگۆڕی لەیەکەیـــەکی بەرهەمدا | AFC= TFC ÷Q |
| تێکرای تێچوونی گۆڕاو<br>Average Variable Cost | ت.ت.گ | ســـەرجەمی تێـــچوونی گـــۆڕاو لەیەکەیـــەکی بەرهەمدا | AVC=TVC÷Q |
| تێکرای سەرجەمی تێچوون<br>Average Total Cost | ت.س.ت | سـەرجەمی تێـچوون لـە یەکەیەکی بەرهەمدا | ATC=AFC+AVC |
| تێچوونی سنوورەکی<br>Marginal Cost | ت.س | گـۆڕان لـە سـەرجەمی تێچووندا کە لە ئەنجامی زیادبوونی یەك یەکەدا لـە سەرجەمی بەرهەمدا | MC=ΔTC÷ΔQ |

# بیردۆزی بەرهەم هێنان
# PRODACTION THEORY

## یەکەم / نەخشەی بەرهەم هێنان: Production function

بریتییە لە بوونی پەیوەندییەکی تەکنیکی لە نێوان بنەماکانی بەرهەم هێنان وەك گۆڕاوێکی سەربەخۆ وە لە نێوان بڕی بەرهەم هێنانی شمەکێك وەك گۆڕاوێکی پاشکۆ .

وە مەبەست لەمەش گوڕانی بنەماکانی بەرهەم هێنانە بۆ شمەکی بەرهەم هاتوو لە ماوەیەکی دیاری کراودا , هەروەها دەربڕی ئاستی تەکنەلۆژی دامەزراوەیەك یان پیشەسازییەك یان ئابورییەکی گشتگیرە.

وە دەکرێت نەخشەی بەرهەم هێنان بە شێوازی بیرکاری وە بە هاوکێشە دەربڕێت :-

$$Y = f(X_1, X_2)$$

$f =$ بریتییە لە شمەکی بەرهەم هێنراو

$(X_1, X_2) =$ بریتین لە بنەماکانی بەرهەم هێنان

$Y$ بریتییە لە گۆڕاوی پاشکۆ، لە کاتێکدا هەردوو نەخشەی بنەماکانی بەرهەم هێنان $(X_1 , X_2)$ گۆڕاوی سەربەخۆن .

## دووەم / یاسای کەم بونەوەی بەرهەم:

## The Law of Diminishing Return

یاسای کەم بوونەوەی بەرهەم گرنگی دەدات بە دەرخستنی گۆڕان لە بەرهەم هێناندا , ئەمەش بە ڕوودانی گۆڕان لە یەکێك لە بنەماکانی بەرهەم هێنان لەگەڵ مانەوەی بڕی بنەماکانی دیکە بە نەگۆڕی و جێگیری.

هەندێ جار ئەم یاسایە پێی دەوترێت (یاسای ڕێژە گۆڕاوەکان) .

١- سەرجەمی بەرهەم و تێکرای بەرهەم و بەرهەمی سنورەکی:-

بۆتێگەیشتن لە یاسای کەم بوونەوەی بەرهەم دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان سێ جۆر لە پێوەری بەرهەم ئەوانەش: (سەرجەمی بەرهەم , تێکرای بەرهەم, بەرهەمی سنورەکی).

جۆری یەکەم: سەرجەمی بەرهەم

بریتییە لە سەرجەمی ئەو بڕە بەرهەمەی شمەکێکی دیاری کراو کە بەرهەم هاتووە لەمیانەی پرۆسەی بەرهەم هێناندا.

جۆری دووەم: نێوەندی بەرهەم یان تێکرای بەرهەم

بریتییە لە دابەش کردنی سەرجەمی بەرهەم بەسەر بڕی بنەمای بەرهەمی گۆڕاو کە لە پرۆسەی بەرهەم هێناندا بەکارهێنراوە .

جۆری سێیەم: بەرهەمی سنورەکی

بریتییە لەو گۆڕانەی کە لە بڕی بەرهەمدا ڕوودەدات لە ئەنجامی بەکارخستنی یەکەیەکی تر لە بنەماکانی بەرهەم هێنانی گۆڕاو هەروەها بریتیشە لە بەرهەم هێنانی دوایەکەی بنەماکانی بەرهەم هێنانی گۆڕاو .

به بەكار هێنـانی چـەمكی سـەرجەمی بەرهـەم دەكرێت یاسـای كـەم بونەوەی بنەماكانی بەم جۆرە ڕوون بكرێتەوە :-

لەكاتی زیاد كردنی یەكێك لە بنەماكانی بەرهەم هێنانی گۆڕاو یەكـەم جار سەرجەمی بەرهەم زیاد دەكات بە تێكڕایەكی زیاد تر تا دەگاتـە خـاڵی وەرچەرخان . لە پاشاندا زیاد بوون بەردەوام دەبێت بـەلاّم بـە تێكڕایـەكی كـەمتر تـا دەگاتـە ئاستێك كـە لـە دوای ئـەو ئاستە بەرهـەم هێنـان كـەم دەبێتەوە .

بەلاّم بە بەكارهێنانی چەمكی بەرهـەمی سنورەكی دەشـێت یاسـاكە بەم جۆرە باس بكرێت :

(لە كاتی زیاد كردنی چەند بنەمایـەك لـە بنـەماكانی بەرهـەم هێنـانی گۆڕاو یەك لە دوای یەك ئەوا سەرەتا بەرهەمی سنورەكی زیاد دەكـات لـە پاشـاندا كـەم دەبێتـەوە تـا دەگاتـە (سـفر) لـە پاشـاندا بـە نیگـاتیڤ دەردەكەوێت).

لە پێناوی ڕونكردنەوەی ئەم یاسایە وە ئـەو قۆناغانـەی كـە بەرهـەم هێنان پێدا تێدەپەڕێت ئەم نموونەیە باس دەكەین :-

گریمان بەرهەم هێنێـك كۆمـەڵێك بنـەمای بەرهـەم هێنـانی هەیـە ئـەو بنەمایانەش بریتین لە پارچە زەوییەكی كشتوكاڵی لەگەڵ كۆمەڵێك ئـامێری كشتوكاڵی لە گـەڵ تـۆو , پـەینی كیمیـایی ﴿بـەلاّم لـەم بـارەدا تـەنها یـەك بنـەمای بەرهـەم دەگۆڕێـت كـە ئـەویش بنـەمای (كرێكـارە)﴾گـەر بێتـوو سەیرێكی خشتەی خوارەوە بكەین دەردەكەوێت لە كاتی زیـاد كردنـی یـەك كرێكار سەرجەمی بەرهەم دەبێتە (٦) تەن . وتێكرای بەرهەمیش بریتی یـە لە شەش تەن , بەلاّم بەزیاد كردنی كرێكاری دووەم سەرجەمی بەرهەم بەرز

دەبێتەوە دەبێت بە ( ١٨ ) تەن بەو جۆرە تێکرای بەرهەم بۆتە ( ٩ ) تـەن بەمانای سەرجەمی بەرهەم بەبڕی ( ١٢ ) تەن گۆڕاوە . کەئەمەش بریتی یە لەبڕی بەرهەمی سنورەکی کرێکاری دووەم , بـەڵام بەکارخـستنی کرێکـاری سێ یەم سەرجەمی بەرهەم( TP ) بووە بە ( ٣٣ ) تـەن بـەوەش تێکـرای بەرهەمبووە بە ( ١١ ) تەن , وە بەرهەمی سنورەکی بـووە بـە ( ١٥ ) تـەن بەم جۆرە دەردەکـەوێت کەسـەرجەمی بەرهـەم زیـادبووە بـە شـێوازی ڕوو لەزیادی وە ئەم قۆناغە پێی دەوترێت قۆناغی زیاد بوونی ڕوولەزیادی .

بەڵام بە بەکارخستنی کرێکاری ژمارە ( ٤ ) دەبیـنین کـە سـەرجەمی بەرهەم بووە بە( ٤٠ ) تەن تێکرای بەرهەم بووە بـە ( ١٠ ) بـەڵام بەرهـەمی سنورەکی بووە بە ( ٧ )تەن بەم جۆرە سـەرجەمی بەرهـەم بەردەوامـە لـە زیادبوون بەڵام بەشێوەی ڕوو لەکەمی تاوەکو کرێکاری ژمارە ( ٨ )کەتیایدا سەرجەمی بەرهەم (٤٩ ) تەنە وە تێکرای بەرهەم بووە بە ( ٦,١ ) تـەن وە بەرهەمی سـنورەکی بـووە بـە ( سـفر ) ئەمـەش قۆنـاغی دووەمـی بەرهـەم هێنانە کە پێ ی دەوترێت قۆناغی زیادبوونی ڕوو لەکەمی .

بـەڵام بـە بەکارخـستنی کرێکـاری ژمـارە ( ٩ ) سـەرجەمی بەرهـەم کـەمی کـردووە بـووە بـە (٤٥ ) تـەن وە تێکـرای بەرهـەم ( ٥ ) تەنـە وەبەرهەمی سنورەکی بووە بە — ٤ کەواتە بنەمایـنوێـیەم بـووە هـۆی کـەم بوونـەوەی بەرهـەم ئەمـەش قۆنـاغی سـێ یـەمی بەرهـەم هێنانـە کـە پێـی دەوترێت ( قۆناغی کەم بوونەوەی ڕەهای بەرهەم ) .

| ژ.ك ژمارەی کرێکار | س.ب سەرجەمی بەرهەم TP | ت.ب تێکرای بەرهەم AP | ب.س بەرهەمی سنورەکی MP | قۆناغ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ٦ | ٦ | ٦ | قۆناغی یەکەم (قۆناغی زیادبوون ) ڕوولەزیاد بوون (زیادە متزایدە) MP>AP |
| ٢ | ١٨ | ٩ | ١٢ | |
| ٣ | ٣٣ | ١١ | ١٥ | |
| ٤ | ٤٠ | ١٠ | ٧ | قۆناغی دووەم قۆناغی زیاد بوونی ڕووله کەمی (زیادە **متناقصة**) AP> MP |
| ٥ | ٤٥ | ٩ | ٥ | |
| ٦ | ٤٨ | ٨ | ٣ | |
| ٧ | ٤٩ | ٧ | ١ | |
| ٨ | ٤٩ | ٦,١ | سفر | |
| ٩ | ٤٥ | ٥ | ٤- | قۆناغی سێیەم قۆناغی کەم بونەوەی ڕەهای بەرهەم (تناقص مطلق) |







**پەیوەندی نێوان سەرجەمی بەرهەم وتێکڕایی بەرهەم و بەرهەمی سنوورەکی**

## سنوورو تايبه تمه ندييه كانى قۆناغه كانى به رهه مهێنان

قۆناغی يەكەم:

له خـاڵى بنەڕەتـەوە دەسـت پـێ دەكات و لـەو خاڵـەدا كـە تێكـراى بەرهـەم يەكسان دەبێـت بـە بەرهـەمى سـنورەكى تـەواو دەبێـت وە ئـەم تايبەتمەندييانەى هەيە:–

أ. سەرجەمى بەرهەم بە تێكڕايەكى زياد تر زياد دەكات.

ب. بەرهەمى سنورەكى گەورەترە لە تێكراى بەرهەم ت.ب > ب.س

ج. كۆتايى دێت لە كاتێكدا ت.ب = ب.س بەرهـەمى سـنورەكى بـەتێكراى بەرهەم.

قۆناغی دووەم:

لـەو خاڵـەوە دەسـت پێـدەكات كـە ت.ب = ب.س تێكـراى بەرهـەم يەكسان بێـت بـە بەرهـەمى سـنورەكى وە لـەو خاڵـەدا كۆتـايى دێـت كـە ب.س = سفر بەرهەمى سنورەكى =سفر.

ئەم قۆناغە ئەم تايبەتمەندييانەى هەيە :–

أ. سەرجەمى بەرهەم زياد دەكات بە تێكڕايەكى كەمتر .

ب. بەرهەمى سنورەكى كەمترە لەتێكراى بەرهەم ب.س > ت.ب

ج. لـە كاتێكـدا كـە بەرهـەمى سـنورەكى دەبێـت بـە سـفر كۆتـايى دێـت ب.س = سفر

قۆناغی سێيەم:

لــەو خاڵــەوە دەســت پێـدەكات كــە ب. س = ســفر وە بەرهــەمى سنورەكى =سفر. سەرجەمى بەرهەم دەست دەكات بە كەم بونەوەى ڕەها وە ئەم تايبەتمەندييانەى هەيە:–

أ.	سەرجەمی بەرهەم هێنان بە ڕەهایی کەم دەکات

ب.	وە بەرهەمی سنوردار دەبێت بە سالب ب. س < سفر

یاسای کەم بوونەوەی بەرهەم یاسایەکی ڕاستی و واقعیانەیە دیاردە ئابووریەکان پشتگیری ڕاستی و دروستی ئەم یاسایە دەکەن ئەگەر ئەمە وا نەبوایە دەتوانرا هەموو ئەو بڕە بەرهەمە بەرهەم بهینرێت کە مرۆڤ دەیویست بەبەکار بردنی هەمان بڕ لە هۆکارەکانی بەرهەم هێنانی نەگۆڕو گۆڕینی یەك هۆکار بۆ بەدیهاتن و دەرکەوتنی ئەم یاسایە دەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوە هەبن:-

١- بوونی هۆکاری بەرهەم هێنانی نەگۆڕ لەگەڵ یەك هۆکاری گۆڕاو، (ئەگەر بێت و هەموو هۆکارەکان بگۆڕێن ئەوا بەرهەم هێن دەتوانێت خۆی لە ڕوودانی ئەم یاسایە بە دوور بگرێت).

٢- دەبێ ئەو هۆکارەی دەگۆڕێت لێك چووبن .

٣- دەبێت ئاستی تەکنەلۆژی نەگۆڕ بێت .

# Revenue:داهات

## (Total revenue) TRV : یەکەم/ سەرجەمی داهات

ئەمە بریتیە لە سەرجەمی ئەو داهاتانەی کە بەرهەم هێن دەستی دەکەوێت بە فرۆشتنی بڕی شمەکی بەرهەم هێنراو ئەمەش بریتی دەبێت لە (بڕی شمەك X نرخی شمەك).

ب × ن = سەرجەمی داهات

س.د = سەرجەمی داهات .

ب = بڕی شمەکی فرۆشراو

ن = نرخی شمەکەکە

چەماوەی سەرجەمی داهات لە بازاڕی کێبڕکێی تەواودا بریتی یە لەهێڵێکی ڕاست کەلە خاڵی بنەڕەتەوە دەست پێ دەکات وە لاریەکەی یەکسانە بە (سفر) .

## (Average Revenue) AR :دووەم :تێکرای داهات

بریتی یە لەداهاتی یەك یەکە لە شمەکی فرۆشراو لەسەرجەمی داهات, بەدابەش کردنی سەرجەمی داهات بەسەر ژمارەی یەکەی فرۆشراو لە بەرهەمەکە دەست دەکەوێت .

$$\text{تێکرای داهات} = \frac{\text{سەرجەمی داهات}}{\text{ژمارەی یەکەی فرۆشراو}}$$

## سێیەم / داهاتی سنورەکی: Marginal Revenue MR

بریتی یە لە گۆڕانی ڕێژەیی لەسەرجەمی داهات لەئەنجامی گۆڕانی بڕی فرۆشتن بەیەك یەکە . یان بریتی یە لە داهاتی دوا یەکەی فرۆشراو .

$$د.س = \frac{\Delta س . د}{\Delta ب}$$

MR = داهاتی سنورەکی

ΔTR = گۆڕان لەسەرجەمی داهات

ΔQ= گۆڕان بڕی بەرهەمی فرۆشراو

لەم خشتەیەدا سەرجەمی داهات وتێکرای داهات وداهاتی سنورەکی لەبازاڕی کێبڕکێ دا ڕوون کراوەتەوە:

| ب<br>بڕی فرۆشراو | ن<br>نرخی یەك یەکە | س.د<br>سەرجەمی داهات | ت.د<br>تێکرای داهات | د.س<br>داهاتی سنورەکی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٢ | ١٠ | ٢٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٣ | ١٠ | ٣٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٤ | ١٠ | ٤٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٥ | ١٠ | ٥٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٦ | ١٠ | ٦٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٧ | ١٠ | ٧٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٨ | ١٠ | ٨٠ | ١٠ | ١٠ |
| ٩ | ١٠ | ٩٠ | ١٠ | ١٠ |
| ١٠ | ١٠ | ١٠٠ | ١٠ | ١٠ |

# فەرهەنگۆکی ئابووری

"ئینگلیزی – کوردی"

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Accounting Profit | قازانجی ژمێریاری |
| Allocation Efficiency | توانستی پسپۆری |
| Allocation of Resources | دابەشکردنی درامەتەکان |
| Average Cost | تێکڕای تێچوون |
| Average Fixed Cost (AFC) | تێکڕای تێچوونی نەگۆڕ |
| Average Labour Productivity | تێکڕای بەرهەمهێنانی کرێکار |
| Average product | تێکڕای بەرهەم |
| Average Revenue (AR) | تێکڕای داهات |
| Average Total Cost (ATC) | تێکڕای سەرجەمی تێچوون |
| Average Variable Cost (AVC) | تێکڕای تێچوونی گۆڕاو |
| Budget Line | هێڵی بودجە |
| Budget | بودجە |
| Business | کارەکان |
| Buyer | کڕیار |
| Capacity | توانا |
| Capital | سەرمایە |
| Capital Good | کاڵای سەرمایەداری |
| Capital Intensive | چڕی سەرمایە |
| Capitalism | سەرمایەدارێتی |
| Capitalistic System | سیستەمی سەرمایەداری |
| Cardinal Utility | کەڵکی ژمێردیی |
| Cartel | یەکێتی بەرهەمهێنەران |
| Ceteris Paribus | لەگەڵ مانەوەی هۆکارەکانی تر بە نەگۆڕاوی |
| Change in Demand | گۆڕان لە خواست |

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Change in Supply | گۆڕان لەخستنەروو |
| Choice | هەڵبژاردن |
| Commodity | شمەك |
| Competitine Firm | دامەزراوەی کێبڕکێیی |
| Competition | کێبڕکێ |
| Complementary Goods | شمەکی تەواوکەر |
| Concave | قۆقز |
| Constant Returns to Scale | نەگۆڕانی داهاتی قەبارە |
| Consumer | بەکاربەر |
| Consumer Goods | شمەکی بەکاربردن |
| Consumer Surplus | زێدەی بەکاربەر |
| Consumption | بەکاربردن |
| Convex | کوڕ |
| Cost Curve | چەماوەی تێچون |
| Cost Schedule | خشتەی تێچون |
| Cross Elasticity of Demand | نەرمی خواست |
| Cross Elasticity of Demand | نەرمی خواستی یەکتربڕ |
| Demand | خواست |
| Demand Curve | چەماوەی خواست |
| Demand Schedule | خشتەی خواست |
| Dependent Variable | گۆڕانی پشتبەست |
| Derived Demand | خواستی داتاشراو |
| Determinants of Demand | سنووربەندەکانی خواست |
| Determinants of Supply | سنووربەندەکانی خستنەروو |
| Diminishing Marginal Returns | کەمبوونەوەی داهاتی سنوورەکی |
| Diminishing Marginal Utility | کەمبوونەوەی کەڵکی سنوورەکی |
| Distribution | دابەشکردن |

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Economic Analysis | شیکردنەوەی ئابووری |
| Economic Efficiency | توانستی ئابووری |
| Economic Goal | ئاما نجی ئابووری |
| Economic Grawth | گەشەی ئابووری |
| Economic Loss | زیانی ئابووری |
| Economic Model | مۆدێلی ئابووری |
| Economic Profit | قازا نجی ئابووری |
| Economic System | سیستەمی ئابووری |
| Economic Theory | بیردۆزی ئابووری |
| Economics | زانستی ئابووری |
| Elastic Demand | خواستی نەرم |
| Elastic Supply | خستنەرووی نەرم |
| Entrepreneur | رێکخەر |
| Equality | یەکسانی |
| Equilibrium | هاوسەنگی |
| Equilibrium Condition | مەرجی هاوسەنگی |
| Equilibrium Price | نرخی هاوسەنگی |
| Equilibrium Quantity | بڕی هاوسەنگی |
| Equity | یەکسانی |
| Exchange | ئاڵوگۆڕ |
| Expectation | پێشبینی کردن |
| Expectation Path | رەوتی فراوانی |
| Explicit Cost | تێچوونی ئاشکرا |
| Export | هەنارده |
| Factor of Production | بنەمای بەرهەمهێنان |
| Firm | دامەزراو |
| Free Goods | شمەکی ئازاد ( خۆرایی ) |

| ئینگلیزی | کوردی | ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|---|---|
| Full Employment | بەگەڕخستنی تەواو | Labor Force | هێزی کار |
| Globalization | جیهانگیری | Labor Productivity | بەبەرهەم هێنانی کار |
| Goal | ئامانج | Land | زەوی |
| Government Intervention | دەستێوەردانی حکومی | Law of Demand | یاسای خواست |
| Government Purchases | کڕاوە حکومیەکان | Law of Supply | یاسای خستنەڕوو |
| Homogeneous Proudutss | بەرهەمە هاوچەشنەکان | Long Run | ماوەی درێژخایەن |
| Human Behavior | ڕەفتاری مرۆیی | Luxury Goods | شمەکە جوانکارییەکان |
| Human Capital | سەرمایەی مرۆیی | Macroeconomics | ئابووری گشتی |
| Imperfect Copetition | کێبڕکێی ناتەواو | Maraginal Cost (MC) | تێچوونی سنووردکی |
| Implicit Cost | تێچوونی شاراوە | Marginal Benefits | کەڵکی سنووردکی |
| In Come | داهات | Marginal Product (MP) | بەرهەمی سنووردکی |
| In Come Elasticity of Demand | داهاتگەری ئەرمی نواندنی خواستی داهات گەری | Marginal Productivity | بەبەرهەم هێنانی سنووردکی |
| Independents Goods | شمەکە سەربەخۆکان | Marginal Rate of Substitution | تێکڕای سنووردکی لەجیاتی بوون |
| Indifference Curves (IC) | چەماوەکانی لێك چوو | Marginal Rate of Technical Substitution | تێکڕای سنووردکی لەجیاتی بوونی تەکنیکی |
| Indifference Map | نەخشەی لێك چوو | | |
| Indinect Tax | باجی ناڕاستەوخۆ | Marginal Revenue (MR) | داهاتی سنووردکی |
| Individual | تاکەکەس | Marginal Utility (MU) | کەڵکی سنووردکی |
| Industry | پیشەسازی | Market Economy | ئابووری بازاڕ |
| Inferion Goods | شمەکی بێ کەڵك | Market Failure | سەرنەکەوتنی بازاڕ |
| Inflation Rate | تێکڕای هەڵاوسان | Market Power | هێزی بازاڕ |
| Interest Rate | تێکڕایی سوو | Market Price | نرخی بازاڕ |
| Intermediate Goods | شمەکی ناوەندی | Microeconomics | ئابووری بڕەکی |
| Investment | وەبەرهێنان | Mixed Economy | ئابووری تێکەڵاو |
| Iso-Cost line | هێڵی تێچوونی یەکسان | Monopolist | قۆرخ کەر |
| Iso-quant Curve | چەماوەی بەرهەمی یەکسان | Monopolistic Competition | قۆرخ کەری کێبڕکێیی |
| Labor | کار | monopsonist | قۆرخ کەری کڕین |
| Labor Factor | بنەمای کار | Monopsony | قۆرخ لە کڕین |

| ئینگلیزی | كوردی |
|---|---|
| Natural Monopoly | قۆرخ كردنی سروشتی |
| Natural Resources | دەرامەتە سروشتیەكان |
| Necessity Goods | شمەكە پێویستەكان |
| Normal Profit | قازانجی ئاسایی |
| Oligopoly | قۆرخ كردنی كەمەكان |
| Open Economy | ئابووری كراوە |
| Opportunity Cost | تێچوونی هەل |
| Optimal | نموونەترین |
| Ordinal Utility | كەڵكی ریزبەندی |
| Perfect Competition | كێبركێی تەواو |
| Perfect Knowledge | زانیاری تەواو |
| Perfect Substitute | جێگیركەرەوەی تەواو |
| Political Economics | ئابووری سیاسی |
| Price Competation | كێبركێی نرخ |
| Price Discrimination | جیاكەری لە نرخ |
| Price Maker | دروستكەری نرخ |
| Price Taker | وەرگری نرخ |
| Private Costs | تێچوونی تایبەت |
| Private Ownership | خاوەنداریەتی تایبەت |
| Private Sector | كەرتی تایبەت |
| Producer | بەرهەم هێنەر |
| Product | بەرووبووم |
| Production | بەرهەم هێنان |
| Production Curve | چەماوەی بەرهەم |
| Productivity | بەبەرهەم هێنان |
| Profit | قازانج |
| Public Goods | شمەكە گشتییەكان |
| Public Sector | كەرتی گشتی |
| Purchasing Power | هێزی كڕین |
| Quantity | بڕ |
| Quantity Demand | بڕی داخواست |
| Quantity Supplied | بڕی خستنەروو |
| Rational Behavior | رەفتاری ژیرانە |
| Raw Materials | كەرەستەی خاو |
| Real Wage | كرێی راستەقینە |
| Rent | موڵكانە |
| Revenue | داهات |
| Sales | فرۆشراوەكان |
| Satisfaction | تێربوون |
| Scarcity | دەگمەنی |
| Seller | فرۆشیار |
| Shortage | كورتی هێنان |
| Social Benefits | سوودە كۆمەڵایەتیەكان |
| Social Cost | تێچوونی كۆمەڵایەتی |
| Social Welfare | خۆشگوزەرانی كۆمەڵایەتی |
| Stability | جێگیربوون |
| Subsidy | كۆمەك |
| Substitute Good | كاڵای جێگیركەرەوە |
| Supply | خستنەروو |
| Supply Curve | چەماوەی خستنەروو |
| Supply Schedule | خشتەی خستنە روو |
| Surplus | زێدەیی |
| Tax | باج |
| Total Cost (TC) | تێچوونی گشتی |

| ئینگلیزی | كوردی |
|---|---|
| Total Expenditure | خەرجی گشتی |
| Total Fixed Cost (TFC) | تێچوونی نەگۆری گشتی |
| Total Product (TP) | بەرهەمی گشتی |
| Total Profit | قازانجی گشتی |
| Total Revenue (TR) | داهاتی گشتی |
| Total Utility | کەڵکی گشتی |
| Total Variable Cost (TVC) | تێچوونی گۆراوی گشتی |
| Utility | کەڵك |
| Value | بەها |
| Value of Marginal Product | بەهای بەرهەمی سنوورەکی |
| Variable Cost | تێچوونی گۆراو |
| Wage | کرێ |
| Wants | ئارەزووەکان |
| Wealth | سامان |
| Welfare | خۆشگوزەرانی |
| Welfare Economics | ئابووری خۆشگوزەرانی |
| Willing | ئارەزوو |

## پێرست